# محمد ﷺ

# مامۆستای هەمووان

**ڕوونکردنەوەیەکی گرنگ**

**ناوەڕۆکی هەموو ڕووداوەکانی ناو ئەم کتێبە پشتی بەئایەتەکانی قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ بەستووە**

# محمد ﷺ

## مامۆستای هەمووان

خالید ئێرتوغروڵ

ناوی کتێب: محمد ﷺ مامۆستای هەمووان

نووسەر: خالید ئێرتوغروڵ

وەرگێڕ: تارا محمد

پێداچوونەوە: بەهرە محمدعلی

تیراژ: (٢٠٠٠) دانە

نۆبەی چاپ: یەکەم - ٢٠١٣

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە
گشتییەکان ژمارە (١٩٩٢)ی ساڵی
٢٠١٢ ی پێ دراوە

# محمد صلى الله عليه وسلم
# مامۆستای هەمووان

خالید ئێرتوغروڵ

وەرگێڕانی: تارا محمد

چاپی یەکەم ١٤٣٤ك - ٢٠١٣ز

## بۆچی دەبێت ئەم کتێبە بخوێنیتەوە؟

بە سەرنجدان لە ناونیشانی ئەم کتێبە، لە گرنگی و پێویستی خوێندنەوەی ناوەڕۆکەکەی تێدەگەین، ئەم کتێبە بەدڵنیاییەوە دەبێت بخوێنرێتەوە، چونکە باس لە **(مامۆستای هەمووان موحەممەد ﷺ)** دەکات، مرۆڤەکانی ئەم سەردەمە لەناو کێشەی زۆر جۆراوجۆر و سەختدا دەتلێنەوەو، زیاد لەهەموو سەردەمەکانی تر پێویستیان بە **(مامۆستای هەمووان موحەممەد ﷺ )** هەیە، چونکە ئەو دەواو چارەسەری هەموو دەرد و ناڕەحەتییەکە...

ئەو گەورەترین مامۆستاو، مەزنترین پەروەرشیارە.

ئەو میهرەبانترین باوك و، بەسۆزترین هاوسەرە.

ئەو باوەڕپێکراوترین مرۆڤ و، خۆشەویسترین دۆستە.

ئەو چارەسەرکەری ئاڵۆزترین کێشەو مەنتیقی ترین ڕاوێژکارە.

ئەو بە خاکیبوونە ناوازەکەی ئاوالاکەری دڵەکانەو، لە بەرزترین تەکنیکەکانی پەیوەندی بەستندا مرۆڤەکان وابەستەی خۆی دەکات.

بەدیعوززەمان سەعیدی نوورسی لە دەربڕینێکی جواندا سەبارەت بە ئازیزمان دەڵێت: " ئەو زاتە خۆشەویستی دڵەکان و، مامۆستای ئەقڵەکان و، پەروەردەکاری نەفسەکان و سوڵتانی ڕۆحەکانە"، هەموو مرۆڤەکان لە پێویستی مامۆستایەکی لەم جۆرەدان.

مرۆڤ کاتێك لەناو ناڕەحەتییەکی بەڕای خۆی چارەنەکراودا دەناڵێنێت، چارەسەرە زۆر نزیکەکانی، تەنانەت ئەوەی کە لەپێش چاوی خۆیەتی نابینێت و بۆ دۆزینەوەی ڕێگەی دەربازبوون و دڵدانەوە لە شوێنی زۆر دوور بەشوێن چارەسەردا دەگەڕێت، مرۆڤی ئەم ڕۆژگارەو بەتایبەتیش

موسوڵمانان، لەناو ئەم هەڵە دراماتیکیەدان... لە کاتێکدا ئاقڵانەترین و درێژخایەنترین چارەسەرەکان لە ژیانی کۆمەڵگەدا کە سەردەمانێك لەمەوپێش لەلایەن پێغەمبەرەوە وەك (پڕۆژەی ئاسوودەیی) پێکهێنراوە، بەهاری خستۆتە ناو ژیانی ملیۆنان مرۆڤەوەو، تا ئەمڕۆش چارەسەری دەردەکانە...

مرۆڤی ئەم سەردەمە، لەژیانێکی ئاڵۆزو پڕکێشەدا دەژیو، ئازارو ناڕەحەتی جۆراوجۆر دێتە ڕێی، ئاتاجی پێشەنگێکی ڕاستەقینەیە تا لە ژیانیدا بیکاتە سەرمەشق، بۆ ئەو مەبەستەش پێویستە لەسەرەتاوە حەزرەت بدۆزێتەوەو، بیناسێت و لێی تێبگات.... هەر بۆیە ئەم کتێبەش (**مامۆستای هەمووان موحەممەد ﷺ**)، دەناسێنێت، ئەو کەسانەی کە لەدنیای ڕۆحی خۆیان و لە ژیانی خێزانی و کاری ڕۆژانەیاندا نایەوێت مل بۆ کێشەکان بدەن، پێویستە ڕاوێژ بە مامۆستایەتی حەزرەت بکەن... بەمانایەکی تر پێویستە دووبارە ببنەوە بە قوتابی ئەو زاتە..

(**مامۆستای هەمووان موحەممەد ﷺ**) خۆی لەدێڕێکیدا ئەمە کورت دەکاتەوە:

"لەڕاستیدا من وەك مامۆستایەك ڕەوانەکراوم"، بوون بەقوتابی ئەم مامۆستایە، گەورەترین شەرەفە..

بەهیوای سوودمەندبوون.....

**خالید ئێرتوغروڵ**

# بەشی یەکەم

## مامۆستایەتی پێغەمبەرمان موحەممەد ﷺ

## لە ژیانی خێزانیدا

پێغەمبەرمان موحەممەد ﷺ کە تێڕوانین و، ڕەفتارو سەلیقەکانی بووەتە نموونە بۆ هەموو مرۆڤایەتی، لە گرنگترین بواری ژیانیشدا کە بواری خێزانییە، ئەو بەشێوازی شیرینی خۆگونجاندن لەناو خێزاندا، لێهاتووترین چارەسەرکاری کێشەکانە... ئەو تێگەیشتنە خێزانییەی کە پێغەمبەرمان موحەممەدﷺ دروستی کردووە تاکو قیامەت مۆدێل و نموونەیە بۆ مرۆڤایەتی، ئەو داڕووخان و لێکترازانەی لەژیانی خێزانی ئەمڕۆدا دەبینرێت، تەنها بە پەیڕەوکردنی ئەم مۆدێل و نموونەیە ڕزگار دەکرێت، پێویستە مرۆڤایەتی زۆر بە باشی ژیانی خێزانیی سەروەرمان موحەممەدﷺ بخوێنێتەوەو لێی تێبگات...

**پرۆفیسۆر دکتۆر عەلی فوئاد باشگیل**

# پێغەمبەرمان ﷺ
# سەرۆکێکی تێگەیشتووی خێزانە

**فەرموودەی پێغەمبەرﷺ**

**(موسوڵمانی ڕاستەقینە ئەو کەسەیە، کە موسوڵمانان**
**لە زیانی زمان و دەستی پارێزراوبن)[1].**
**پێغەمبەرمان موحەممەد ﷺ.**

ئەو زاناو لێکۆڵەرەوانەی کە سەرقاڵی دیراسەکردنی ژیانی پێغەمبەرﷺ بوون، ڕووبەڕووی چەندین چارەسەرو تیۆری کاریگەرو پڕپەند بوونەتەوە بۆ کێشە هەنووکەییەکانی ئەمڕۆمان... هەندێك لە نیەت خراپ و ڕەخنەگرەکان بەبینینی ئەم ڕاستییە دەڵێن: "ئەو پێغەمبەر بووە، بێگومان ژیانێکی نموونەیی دەبێت، ئێمە ناتوانین ئەوانە لەژیانماندا پیادە بکەین." بەم جۆرە بەمەبەستەوە بەربەست دروست دەکەن و شێوازێك لە یاخیبوون دەگرنەبەر...

ئامانجیشیان پەیڕەونەکردنی ڕێبازی موحەممەدەﷺ لەناو ژیانی کۆمەڵگەدا، لە کاتێکدا ئەو زاتە ژیانێکی سەختی گوزەراندووەو، ناڕەحەتی وەهای بەسەرهاتووە کە بەسەر هیچ مرۆڤێك نەهاتووە...

---

١- صحيح البخاري، رقم الحديث: ١٠

لەم سالانەی دواییدا زۆرێك لە شارەزایانی بواری پەروەردە لە ڕۆژئاوادا، لە شیکردنەوەی ژیانی پێغەمبەرمان موحەممەدو بەتایبەت پەروەردەکاری ئەودا تێراما بوون، لەبەرامبەر ئەم پیادەکاریە مۆدێرن و سەردەمی و هۆشمەندانەیەدا، زۆرێکیان موسوڵمان بوونیان هەڵبژاردووەو بەخۆشحاڵیەوە هەستیان بە بەرپرسیارێتی کردووە لەبەرامبەر گەیاندنی ئەم پەیامەدا بەهەموو دنیا.

پێغەمبەرمانﷺ لە هەموو بوارەکاندا، بە هەموو ڕەفتارو، وتەو هەڵسوکەوتەکانیەوە بووەتە مامۆستای هەموو مرۆڤایەتی، بەڵام گرنگترین بواری مامۆستایەتیەکەی بریتی بووە لە گرتنەبەری ڕێگەو شێوازی زۆر گونجاو و کاریگەر هەروەها دۆزینەوەی چارەسەری پێویست بۆ کێشەکان لەژیانی خێزانی و پەروەردەکردنی منداڵدا، بەبایەخترینیشیان تێگەیشتوویی و خۆگونجاندنی دوور لەگومانی ئەو سەروەرەیە.

ماڵی پێغەمبەر ﷺ زۆر سادە بوو، ڕەنگە هەژارترین خێزانی دنیا بووبێت، بەڵام ئاسوودەییەکەی ئەویٚ، لەئاستێکدایە کە تا قیامەت قسەی لەبارەوە دەکرێت.

موحەممەدﷺ، وەکو باوکێك، وەکو سەرۆکێکی خێزان، زۆر نەرم و نیان و، میهرەبان و تێگەیشتوو بوو، ئەو گرنگی بە هاوسەرو منداڵەکانی دەدا، بیرۆکەو دیدگای ئەوانی بەهەند وەردەگرت و لێك نزیکبوونەوەو هاوسەنگیەکی گونجاوی بەرجەستە دەکرد، هەرگیز بیٚ بیرکردنەوە بڕیاری نەدەدا، کەم و کورتیەکانی زەق نەدەکردەوە و بەبیٚ پێوەر پێی لە هەڵەکان نەدەنا، ئەو هەمیشە جوانیەکانی دەبینی، بۆ هەڵەکانیش بەنەرمونیانی ئاگادارکردنەوەی دەداو بەهێنانەوەی هۆکار ڕێگەی تێگەیاندنی دەگرتەبەر.

ئەوەندە گرنگی بەئەندامەکانی خێزانەکەی دەدا، ئەوەندە بایەخی بەڕەخساندنی ئارامی و خۆش گوزەرانی بۆ ئەوان دەدا، کە هاوەڵەکانی دەوروبەری سەریان سوڕدەما، یەکێك لەوانەش پێشەوا عومەرﷺ، ناسراو بەپیاوی دەوڵەت و دادپەروەریی.

سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص دەڵێت : ئیمامی عومەرﷺ داوای مۆڵەتی هاتنەژوورەوەی لە پێغەمبەرﷺ کرد لەو کاتەدا کۆمەڵێك لە ئافرەتانی قوڕەیش لە خزمەتیدا بوون و پرسیاریان لێ دەکرد و ، داوای ئامۆژگاری زیاتریان دەکرد، دەنگیان هەڵبڕیبوو، کاتێك عومەر مۆڵەتی خواست، هەستان و خێرا خۆیان دایە پەنای پەردەوە، پێغەمبەرﷺ بەدەم پێکەنینەوە ڕێگای (عومەر)ی دا ، ئیمامی عومەرﷺ فەرمووی: یاخوا هەمیشە لێو بەخەندە بیت ئەی پێغەمبەری خوا، بەچی پێدەکەنیت؟، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: "بۆ حاڵی ئەو ئافرەتانە کە لەلای من دانیشتبوون هەر کە دەنگی تۆیان بیست یەکسەر خۆیان خستە پەنا پەردەوە". عومەر وتی: حەق وابوو سامی تۆ زیاتر بیانگرێت ئەی پێغەمبەری خوا، لە پاشان عومەر بە ئافرەتەکانی وت: ئەی ئافرەتانێك کە دوژمنی خۆتانن! ئێوە سام لە من دەکەن، کەچی سام لە پێغەمبەرﷺ ی خوا ناکەن؟ وتیان: تۆ بە زەبر و توندی. پێغەمبەرﷺ فەرمووی: "سوێند بەو کەسەی گیانی منی بە دەستە هیچ کات شەیتان بە تۆ نەگەیشتووە لەسەر ڕێگەیەکدا مەگەر ئەو ڕێگایەکی تری گرتووە (واتە ڕێگای خۆی گۆڕیوە)" [1].

---

١- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٥٧٤٠

بەڵێ ... ئەمە جیاوازی پێغەمبەرمان بوو.. قبوولکردنی مرۆڤەکان وەکو خۆیان ، بایەخ پێدان و زوێرنەکردنی هیچ کەس بە لەڕوودانەوەی هەڵەکانیان.... ئایا ئەمانە سەرچاوەی ئاسوودەیی خێزان نین؟!

## نموونەیەکی پەندئامێز

## بۆچی پێغەمبەرمانﷺ لەگەڵ چەند ئافرەتێك هاوسەرگیری کردووە؟

تایبەتمەندی پێغەمبەرمان ﷺ لە فرەژنیدا، لەسەردەمی ئەمڕۆماندا بووەتە باسێك کە بەردەوام ڕەخنەی لێ دەگیرێت، بەڵام کاتێك هۆکاری دروستی ئەم هاوسەرگیریانە زانرا، ئەو کات دەبینرێت کە چەند پڕماناو وردبوون...

ئەو سەردەمەی پێغەمبەرمانﷺ تیایدا ژیاوە ، بونیادی کۆمەڵگەو پێکهێنانی هاوسەرگیری بە ئەندازەیەك پڕ لە دژایەتیکردن بووە کە عەقڵ تەصەوری ناکات..! منداڵە کچەکان تێکڕا زیندە بەچاڵ دەکران و هەرگیز نرخ و بایەخ بۆ ئافرەت دانەدەنرا . مرۆڤەکان بە پارە کڕین و فرۆشتنیان پێوە دەکرا و هاوسەرگیریش ڕێکخستنێکی دیاریکراوی نەبوو، هەر کوڕێك بەویستی خۆی هاوسەرگیری لەگەڵ ئەو ئافرەتە دەکرد کە خۆی بیویستایە، بەتایبەتیش هاوسەرگیری پیاوی پیر لەگەڵ کچی گەنجدا بەزۆر، بووبووە خوونەریت لەناویاندا، هەربۆیە ئەم تێگەیشتنە تێکەڵ و ئاڵۆزو پڕ لەتاریکییەی ژیان، بە ڕەوانەکردنی پێغەمبەری ئازیزمانﷺ بەجۆرێك بەمەدەنی کرا، کە لەدوای ئەوەوە ئەو ڕۆژانە ناونرا

به (سەردەمی ئاسوودەیی). باشە ئەی بۆچی پێغەمبەرمانﷺ بەجێی تاکە هاوسەرێك، چەند هاوسەرێکی هەبوو؟! بۆ تێگەیشتن لەم بابەتە، پێویستە لە بونیادی کلتووری و کۆمەڵایەتی ئەو سەردەمەی نیمچە دوورگەی عەرەب تێبگەین، لەدەستپێکی بڵاوبوونەوەی دینی ئیسلام لەناو عەرەبستاندا، پێغەمبەرﷺ ڕووبەڕووی دژایەتییەکی زۆر لە نەریتە باوەکانی دژ بەدین و ئەقڵ و پەیوەندییە کۆمەڵاتیەکانی سەردەمی جاهیلی بووەوە، یەکێك لەوانەش بابەتی ڕێگەپێدانی هاوسەرگیری بێسنووری پیاوان بوو لەگەڵ ژناندا، بەجۆرێك ئەو پیاوەی توانای هەبوایە، ئەوەندەی بیویستایە هاوسەرگیری لەگەڵ ژناندا دەکرد، ئافرەتەکان وەکو کاڵایەك کە کڕین و فرۆشتنیان پێوەبکرێت تەماشادەکران.

بەڵێ ئیسلام کە هات سنوورێکی بۆ ئەم نەریتە جاهیلیانەیە دانا، ئەوەی ڕوون کردەوە کە پیاوی موسوڵمان نەوپەڕی لەگەڵ چوار ئافرەتدا دەتوانێت هاوسەرگیری بکات، خوای گەورەش فەرموویەتی: ﴿وَإِنْ خِفْتُمْ أَلاَّ تُقْسِطُواْ فِي الْيَتَامَى فَانكِحُواْ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ النِّسَاء مَثْنَى وَثُلاَثَ وَرُبَاعَ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلاَّ تَعْدِلُواْ فَوَاحِدَةً أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ ذَلِكَ أَدْنَى أَلاَّ تَعُولُواْ﴾ (النساء: ٣)، واتە: (ئەگەر ترسان لەوەی کە عەدالەت نەکەن لەگەڵ کچە هەتیوەکان کە مارەیان ببڕن، ئەوا واز لە ئافرەتی هەتیو بێنن و، ئەوانەی بەدڵتانن لە کچانی ناهەتیو مارە بکەن، دوان، یا سیان، یا چوار، ئەگەر ترسان لەوەی لەنێوان ئەم ژنانەتاندا عەدالەت نەکەن ئەوا هەریەك ژن بێنن، یا لەگەڵ ژنە (جاریە)ی کڕاوتان دا ڕابوێرن. ئەم ڕێگایە نزیکترین ڕێگایە بۆئەوەی لە حەق لانەدەن.)[١]

---

١- خولاصەی تەفسیری نامی، ل: ٧٧ .

وەك زۆر كەس بەهەڵە لەمە تێگەیشتوون، هاوسەرگیری لەگەڵ چوار ژندا ئیسلام نەیهێناوە، بەڵكو هاوسەرگیری بێ سنووری پێش خۆی سنووردار كردووە، ئیسلام هەرچەندە ڕێگە بە هاوسەرگیری لەگەڵ چوار ژندا بدات، بەڵام هاوسەرگیریش لەگەڵ یەك ئافرەتدا بەبنچینەو گرنگ دادەنێت. لە هەندێك بارودۆخی پێویستیشدا ڕێگە بە هاوسەرگیری دەدات لەگەڵ زیاتر لە ئافرەتێك ئەمەش بەتەواوی پەیوەستە بەمەرجی دادپەروەری و هاوسەنگی ڕاگرتن لەنیوان هاوسەرە خانمەكاندا، ئەوەتا خوای گەورە لەم بارەیەوە دەفەرموویت: ﴿وَلَن تَسْتَطِيعُواْ أَن تَعْدِلُواْ بَيْنَ النِّسَاء وَلَوْ حَرَصْتُمْ فَلاَ تَمِيلُواْ كُلَّ الْمَيْلِ فَتَذَرُوهَا كَالْمُعَلَّقَةِ وَإِن تُصْلِحُواْ وَتَتَّقُواْ فَإِنَّ اللّهَ كَانَ غَفُوراً رَّحِيماً﴾ النساء: ١٢٩، واتە: (ئێوە هەرگیز ناتوانن بە تەواوی عەدالەت لە بەینی ژنەكانتانا بكەن و بێكەم و زیاد لە دڵ و دەرەوە یەكسان بن لەگەڵیان، با زۆریش ئەم عەدالەتەتان مەبەست بێ و بتانەوێ بیكەن بەڵام هەتا ئەتوانن لە عەدالەت لامەدەن و، ژنەكانتان وەك (معلقە) مەهێڵنەوە كە نە ژنێكی خاوەن مێردو حاڵ و ماڵ بن و نە ژنێكی تەڵاقدراو بن بتوانن بۆ خۆیان شوو بكەن. جا ئەگەر ئەو ناوبەینەی كە تێكتاندابوو چاكتان كردەوەو، لە خودا ترسان و خۆتان لە ناشەرعی پاراست، ئەوا خودا لەوەی پێشووتان چاوپۆشی ئەكات. خودا گوناهبەخش و میهرەبانە.)[1]

بەم جۆرە سەرنجمان بۆ هەستیاری و گرنگی ئەم بابەتە ڕادەكێشێت، ئەمەش نیشانەیەكە بۆ هاوسەرگیری نەكردنی زیاتر لەیەكێك، جگە لە بارودۆخە پێویستەكان.

---

١- خولاصەی تەفسیری نامی، ل: ٩٩ .

بەدرێژایی هەموو سەردەمەکانی مێژوو شەڕو داگیرکاری و قات و قـڕی و بارودۆخـە هاوشـێوەکانی تـر بووەتـە هۆکـاری کەمبوونـەوەی پیـاو و زیادبوونی نفوسی ژنان، هەربۆیە ئەو ئافرەتانەی کە لەگەڵ منداڵەکانیان لـە بـارودۆخی قورسـدا ماونەتـەوە، پارێزگاریکردنیـان لەلایـەن پیاوانـەوە چۆتە باری پێویستیەوە، لە جەنگی یەکەمی جیهانیدا تورکیا و لە جـەنگی دووەمـی جیهانیـدا ئـەڵمانیا، ئەمـەیان بەسـەردا هـاتووە، لەئێستاشـدا لـە عێراق ئەم بەلا کۆمەڵایەتیە ڕوو لەزیادبوونە.

بەمجۆرە و لەم حاڵە نائاساییانەدا، کاتێك فرەژنـی قەدەغـە دەکرێـت یان ڕێی لێ دەگیرێت، حاڵی ئـەو ئافرەتانـەی کـە لەگـەڵ منداڵـەکانیان لـە بێچارەییدا دەمێننەوە بەڕوونی ئاشکرایە، لەبەرئەوە هێنانی زیـاتر لـەژنێك لەبارودۆخی پێویستدا ڕێگەی پێـدراوە، ئـەویش بـە مـەرجی داپـەروەری و هاوسەنگی ڕاگرتن لەنێوانیاندا، بۆیە پێغەمبەری ئازیزمانﷺ لە هەستیاری ئەم باسەدا فەرموویـەتی: "ئەگـەر پیاوێك دوو ژنـی هـەبوو، زیـاتر مـەیلی بەیـەکێکیان ئـەدا ( واتـە دادپـەروەر نـەبوو لەنێوانیانـدا) ئـەوا لـە ڕۆژی قیامەتدا بەلایەکی خوارو ئیفلیجەوە حەشردەکرێت." [١].

(بەدیعوززەمان سەعیدی نورسی)یش سەبارەت بە ڕێگەپێدانی ئیسلام بـە هێنـانی چوار ژن، بـەم جـۆرە دەدوێـت: "هێنـانی چـوار ژن، لەگـەڵ سروشـت و عـەقڵ و حیکمەتـدا هـاوڕاو گونجـاوە، شـەریعەت چـواری لـە یەکێکـەوە دانـەناوە، بـەڵکو لەهەشـتەوە کـەمی کردۆتـەوە بـۆ چـوار، بەتایبـەتیش شـەریعەت مـەرجی وەهـای لەفرەژنیـدا دانـاوە کـە بـە لەبەرچاوگرتنیان هیچ زیانێك سەرهەڵنادات".

١ - ابن ماجه، رقم الحديث: ١٩٦٥.

هاوسەرگیری پێغەمبەری ئازیزیشمان ﷺ لەگەڵ زیاتر لە ئافرەتێکدا هۆکاری زۆر پێویستی لەپشتەوەیە، بەڵام لەنێو ئەمانەدا، کەسانێك کە خاوەنی بیروبۆچوونێکی هەڵەن لە نەزانینیانەوەیە یان بەئەنقەستە کە دەڵێن ئەمە ئارەزووبازییە، هەرگیز وانیە، چونکە کەسێك کە لەتەمەنی بیست و پێنج ساڵیدا لەگەڵ خەدیجە (ڕەزای خوای لێ بێ) کە چل ساڵان بووە هاوسەرگیری کردبێت و ئەم هاوسەرگیریەشی تا تەمەنی پەنجاو چوار ساڵی لەگەڵ یەك هاوسەردا درێژە پێدابێت، هەرگیز مەنتیقیی نییە کە لە باسی فرەژنیدا ئەم مرۆڤە لە ئارەزووبازی نزیك بکرێتەوە، هەرگیز ناکرێت. لەدوای وەفاتی خەدیجە(ڕەزای خوای لێ بێ) هاوسەرگیری ئەو زاتە لەگەڵ زیاتر لەئافرەتێکدا لەبەر چەندین پێویستی گرنگ و حیکمەتی بێ سنوور بووە.

فرەژنی لە ژیانی پێغەمبەرمان ﷺ هۆکاری زۆر گرنگی لەپشتەوە بووە، کە لێرەدا ئاماژە بە هەندێکیان دەکەین:

*پارێزگاریکردن لە بێ چارەو بێ سەرپەرشتیارەکانی دوای جەنگەکان و دوای هیجرەت.

* گەیاندنی ئیسلام لە ڕێگەی ئەو پەیوەندییانەی بەهۆی هاوسەرگیرییەوە لەنێوان خێزانەکاندا دروست دەبێت.

* خەڵاتکردنی ئەوانەی لەپێناو ئیمان و قورئاندا فیداکارییان کردووە.

* بەهێزکردنی پەیوەندی دۆستایەتی لەنێوان هاوەڵە نزیکەکانیدا بەهێنانی کچەکانیان.

* پەروەردەکردنی مامۆستاگەلێك کە وردەکاری و لایەنەکانی ژیانی خێزانیی بۆ خانمەکان ڕوون بکەنەوە.

بەهۆی زۆری ئافرەت لە نیمچە دوورگەی عەرەبیدا پێگەیاندنی ئەو مامۆستایانە بۆ ناساندنی ئیسلام پێیان فرەژنی کارێکی پێویست بووە،

لەبەر ئەوەی ئافرەتەکان زۆر کات بۆ پرسیارکردن ڕاستەوخۆ نەدەچوونە لای پێغەمبەر ﷺ، بەڵکو هاوسەرەکانی پێغەمبەر ﷺ هەم بووبوونە مامۆستا بۆ ئافرەتەکان، هەمیش لەنێو کۆمەڵگەدا بووبوونە نموونەی خێزانی ئیسلامی کە دیدگای ئیسلامیان لە " ژیانی خێزانی" خۆیاندا ڕەنگ پێدابووەوە.

بەکورتی، لەئیسلامدا هێنانی یەك ژن بنەڕەتییەو فرەژنیش ئیستسنایە بەتەنها لەکات و بارودۆخی پێویستدا لەبەرچاودەگیرێت. ئەمە لەکاتێکدا ئازیزمان ﷺ لەبەرامبەر عەلیدا کە هاوسەری کچەکەی-فاطمە- بووە کاتێك دەیەوێت ژنێکی تر بهێنێت دژی دەوەستێت و داوای لێ دەکات کە کچەکەی تەڵاق بدات ئەگەر ئەوکارە دەکات.

لەمەوە تێدەگەین کە جگە لە هۆکارە پێویستەکان، ئیسلام فەرمان و پێشنیاز بۆ فرەژنی ناکات، بەڵکو لەکاتی زۆر پێویست و بەمەرجی هاوسەنگی ڕاگرتن ڕێگەی بەمە داوە.

# پێغەمبەرمانﷺ
# ژیانێکی خێزانی سادەی هەبوو

**فەموودەی پێغەمبەرﷺ**

**" ئارام بن، مەترسن ، من کوڕی ژنێکی قورەیشیم کە گۆشتی وشککراوەی خواردووە"[1]**

**پێغەمبەرمان موحەممەدﷺ**

یاسایەکی هاوتا هەیە لەنێوان شارەزایانی بواری پەروەردەی خێزان کە دەڵێت:" ئاسوودەیی، لەژیانی سادەدایە"!

ژیانی خێزانیی پێغەمبەرمان ﷺ تا بڵێی سادەو ساکار بوو، لە ماڵەکەیدا تەنها چەند کەلوپەلێکی پێویستی هەبوو، ئەو وەکو پاشاکان لە کۆشك و تەلاری ڕازاوەو بەڕەونەقدا نەدەژیا، بەڵکو بەسادەیی وەکو خەڵکی دەژیا.

لەماڵی پێغەمبەرداﷺ تەنها جێگەیەکی زۆر سادە، کە پێکهاتبوو لە دۆشەکێکی پەڕ و ڕیشاڵ لەگەڵ سەرینێك دەبینرا. جێگەی نوستنەکەی بەپەردەیەکی کۆن داپۆشرابوو، هەروەها دۆلکەی ئاو و مەنجەڵێك هەبوون، جگە لەمانە ڕەفەیەك کە خورماو گەنمی لەسەر دادەنرا ، دەستکەوانێکی

---

١- مستدرك على الصحيحين للحاكم، رقم الحديث: ٤٣١٢

بچووك بۆ هاڕینی گەنم، جامێك بۆ هەلگرتنی ئاو، هەروەها ئاوێنەیەکی بچووك لەماڵەکەیدا بەدی دەکران.

کاتێك میوانێك دەهاتە ماڵەکەی، فەرمووی لێ دەکرد بۆ سەر جێگەو دۆشەکە پەڕ و پیشاڵەکە و خۆیشی لەسەر حەسیر دادەنیشت.

سەرۆکی هۆزێك کە خۆی سەردانی ماڵەکەی پێغەمبەری ﷺ کردووە، بەم جۆرە باس لەو دیمەنە کاریگەرانە دەکات کە لەمیانەی سەردانەکەیدا بینیویەتی: " تازە موسوڵمان بوو بووم، چوومە سەردانی پێغەمبەر ﷺ، بەڵام بەتایبەتی دەمویست ماڵەکەی و ژیانی خێزانیی ئەو ببینم، ڕێگەی بە چوونە ژوورەوەم دا، من وام بیردەکردەوە کە ئەویش وەکو هەموو سەرکردەیەك لە ماڵێکی گەورەو ڕازاوەدایەو خزمەتکارو پاسەوان بەدەوریدا هەڵدەسوڕێن... کە چوومە ناو ماڵی پێغەمبەرەوە ﷺ زۆر سەرسام بووم، لەو نێوەندەدا نە سابات و کۆشك هەبوو، نە ماڵێك کە پاسەوان پاراستبێتی! ماڵەکانی ئێمە لە چاو ماڵی پێغەمبەر ﷺ وەك کۆشك بوون، پێغەمبەر ﷺ خزمەتکارو پیاوی تایبەتی نەبوو کە بێن و وەکو پەروانە لە دەورمان بسوڕێنەوە، ئەوێ ماڵێکی سادەو خاکی و نموونەی ماڵێکی بێ فیزی موسوڵمانانە بوو، بە گەیشتنم بە حضوری پێغەمبەر ﷺ زیاتر سەرسام بووم، خۆی لەسەر حەسیرەکە دانیشت و بەنرخترین ڕاخەری ماڵەکەشی بۆ من ڕاخست. شەرمەزار بووم... ئەو زاتە بەشێوەیەك ڕەفتاری لەگەڵ میوان دەکرد کە لەبەرامبەری توامەوە..

ئەو کات تێگەیشتم کە نێردراوی خوا سەرکەوتوو دەبێت، چونکە بۆ خۆی نا بەڵکو بۆ دین و ئومەتەکەی دەژی".

بەڵێ ئەو بۆ خۆی و خێزانەکەی نا، بەڵکو بۆ موسوڵمانان و، ئایین و بانگەوازەکەی ژیا، لە پشت هەموو سەرکەوتنێکەوە دڵسۆزی حەشاردراوە، ئازیزمان ﷺ بەدڵسۆزی و خەمخۆری زەمینەسازی لە دڵەکاندا کردو

مرۆڤەكانی عاشقی نوورەكەی كرد، ئەو وەكو خەڵك ژیا، بووە نموونە بۆ مرۆڤـەكان، وانـەی پـڕ پەنـدی بەسـەركردەكان دا، چـونكە ئاسـوودەیی ڕاستەقینە لە ژیانی سادەدایە.

## نموونەیەكی پەندئامێز

## پێغەمبەری بەندە

پێغەمبەرمان ﷺ خۆشی لە بەرزفڕی و ناوبانگ و ژیانی دەوڵەمەندانە نەدەهات و سادەیی هەڵدەبژارد، بۆیە لەفەرموودەیەكیدا دەفـەرمووێت: "ئـەو ستایشـە زیـاد لەپێویسـتەی كـە مەسـیحیەكان بـۆ عیسـای كـوڕی مەریەم(عليه السلام) دەیكـەن، ئێـوە بـەو جـۆرە ستایشـم مەكـەن، مـن بەنـدەی خوام، تەنها پێم بڵێن: "بەندەو نێردراوی خودا"، خوای مەزن پێغەمبـەری ئازیزی لەنێوان دوو هەڵبژاردندا سەرپشك كردبـوو (پێغەمبـەری حكومـدار) یان (پێغەمبەری بەندە) ئەویش پێغەمبەری بەندەی هەڵبـژاردو بەسـادەیی ژیـانی بەسـەربرد، خـوای خـاوەن حـەقیش لەبەرامبـەر ئـەم ڕەفتـارە نموونەییەیدا ئـەوی كـردە بـەڕێزترین نـەوەی ئـادەمی و لـەڕۆژی قیامەتـدا كردی بە شەفاعەتكار بۆ مرۆڤەكان.

ئیبنــو عــەباس (ڕەزای خوایــان لێبێــت) دەفــەرمووێت: كاتێــك پێغەمبــەرمان ﷺ دەچـووە سـەردانی نـەخۆش ، لەپشـت سـەرییەوە دادەنیشت و دڵنەوایی دەكردەوە و دەیفەرموو: "قەیدی نییە، خوا حـەزكا كـەفارەت و پاككـەرەوەی گوناهـە"[١]... ئـەو هەمیشـە سـنگێكی فراوانـی

---

١- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٣٤٤٠

هەبوو، ژیانی باق و بریق و پڕ لە ڕەفاهەتیی پێ قبوڵ نەبوو، پێغەمبەرمان ﷺ لەگەڵ جەنازەدا ئامادە دەبوو، سواری گوێدرێژ دەبوو، ئەگەر تەنانەت کۆیلەیەکیش بانگهێشتی بکردایە، بەدەم داواکەیەوە دەچوو.

ڕۆژێك پیاوێك چووبووە لای لە ترس و شەرمی گەورەیی پێغەمبەر ﷺ لەرزی بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرمووبوو: "ئارام بن، مەترسن، من کوڕی ژنێکی قوڕەیشیم کە گۆشتی وشککراوەی خواردووە"، ئەم خاکیبوون و یەکسان ژیانیەی لەگەڵ خەڵکدا بۆتە هۆکاری ئەوەی کە چەندین سەدەیە لە دڵی ملیۆنان کەسدا جێگەی گرتووە.

# پێغەمبەرمان ﷺ زۆر بایەخی بە هاوسەرەکانی دەدا

**فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ**

**" هەر کەسێك لەپێناوی خوادا ببەخشێت و لەپێناوی خوادا دەست پێوە بگرێت و، خۆشویستن و ڕقلێبوونی لەپێناوی خوادا بێت و، لەپێناوی خوادا هاوسەرگیری بکات، ئەوا ئیمانەکەی تەواو کردووە."[1]**

**پێغەمبەرمان موحەممەد ﷺ**

**ئەو چارەسەرانەی کە پێغەمبەری ئازیز ﷺ سەبارەت بەکێشە خێزانیەکان هێناویەتییە مەیدان و ئەو نزیکییەی ئەو لەگەڵ هاوسەرەکانی، ڕزگارکەرێکی گرنگ و پێویستە بۆ ئەو لێکترازانە خێزانیانەی ئەمڕۆی ناو کۆمەڵگاکان، بەجۆرێك ژیانی ڕۆژانەی پێغەمبەر ﷺ لەناو خێزاندا پڕە لە وانە و هەڵسوکەوتی پڕ پەند.**

**ئەو ژن و پیاوانەی بە دەست کێشەکانەوە دەناڵێنن و ناو دەرگای دادگاکان بەرنادەن، ئەگەر ژیاننامەی پێغەمبەریان ﷺ بخوێندایەتەوە، ئەو ئازارو ناڕەحەتیەیان بەسەر نەدەهات، پێغەمبەرمان ﷺ بەپێی گونجان**

---

١- سنن الترمذي، رقم الحديث: ٢٥٠٥

دوای بەڕێ کردنی کارەکانی دەوڵەت و دانیشتنە پێویستەکانی، کاتەکانی لە ماڵ و لە ناو خێزانەکانیدا بەسەردەبرد، ماڵی ئەو قوتابخانەیەکی پەروەردەکردن بوو، لەوێ کەش و هەوایەك هەبوو کە مرۆڤی گەورە دەکرد و بەرەو ئاسوودەیی و خۆشگوزەرانی دەبرد، ئەوەندە بایەخی بە هاوسەرەکانی و منداڵ و نەوەکانی دەدا کە بەم هەڵسوکەوتانەی بەدرێژایی سەردەمەکان نهێنی پەروەردەکردن نیشانی هەموو مرۆڤایەتی دەدات.

عائیشە(ڕەزای خوای لێبێت) دەفەرموێت: دوو کەنیزەکم لەلابوون گۆرانیان دەوت، سروودیان بەسەر هەرای ڕۆژی بوعاسدا دەوت، کە کوشتارێکی زۆر لەو ڕۆژەدا لە پێش هاتنی ئیسلام، لە نێوان ئەوس و خەزرەجدا ڕوویدابوو، لەو کاتەدا پێغەمبەر ﷺ هاتە ژوورەوە، تەشریفی چوو لەسەر نوێنەکەی خۆی پاڵکەوت و ڕووی لە ئێمە وەرچەرخان، پاش کەمێك ئەبوبەکری باوکیشم تەشریفی هات، چاوی بە حاڵەکە کەوت، لە پێشا لە منی خوڕی و پیاما هەڵشاخا، ئەوجا فەرمووی: (بالۆرەی شەیتان و لە خزمەت پێغەمبەری خوادا؟ شتی وا چۆن دەکەن؟).

پێغەمبەریش ﷺ ڕووی کردە ئەبوبەکر و فەرمووی: "ئەی ئەبوبەکر! وازیان لێ بێنە با سروودەکەیان بڵێن، چونکە ئەمڕۆ جەژنی موسوڵمانانە".

عائیشە فەرمووی: جا کاتێك ئەبوبەکر ئاگای لە ئێمەنەما، بە ئاماژە تێم گەیاندن کە بڕۆن، کەنیشکەکانیش ڕۆیشتن.[1]

پێغەمبەر ﷺ لەکاتی ڕابواردنی هاوسەرەکانیدا بەشێوەیەکی شەرعی دەنگی لێ نەدەهات، بەدڵخۆشی ئەوان ئەویش خۆشحاڵ دەبوو، هەرگیز ڕێگەی بەناڕەحەت بوونی ئەوان نەدەدا، لەم باسەدا نموونەیەکی تریش

---

١- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٢٧٧١ .

لەنێوان ئازیزمان و خاتوو عائیشەدا دەهێنینەوە: پێغەمبەری خوا لە غەزای تەبوك، یان خەیبەر گەڕایەوە ، ئەو ڕەفەیەی خاتوو عائیشە کەلوپەلەکانی خۆی لێ دانابوو، پەردەیەکیان بەسەردا درابوو، کە با لێی دەدا، پەردەی سەر یاریچەکانی عائیشەی لادەدا، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: " ئەی عائیشە! ئەمانە چین"؟ ئەویش وتی: کچەکانمن..

پێغەمبەری خواش لەو کاتەدا چاوی دەچێتە سەر یەکێك لە یاریچەکان، کە ئەسپێکی دووباڵ دەبێت، کە دەپرسێت ئەمانە چین؟ عائیشە وەڵامی دەداتەوە کە: (ئەسپ)ن، ئەویش بەزەردەخەنەیەکەوە دەفەرموێت:" ئەی ئەوەی سەر ئەسپەکان چییە..!"

خاتوو عائیشەش وەڵامی دەداتەوە: ئەوانە باڵەکانی ئەسپەکەن.

پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێت:

"ئەی عائیشە، ئایا ئەسپ باڵی هەیە؟!"

خاتوو عائیشەش دەڵێت:

" ئەی نەتبیستووە کە ئەسپەکانی حەزرەتی سولەیمان (سەلامی خوای لێ بێ) باڵیان هەبووە؟!"

پێغەمبەری خوا ﷺ بەمە دەست دەکات بەپێکەنین.

خاتوو عائیشە کە ئەمەمان بۆ دەگێڕێتەوە دەفەرموێت:

" پێغەمبەری خوا ﷺ کە ئەوەی بیست دەستی کردە بە پێکەنین، تەنانەت ئەوەندە پێکەنی کە ددانە پیرۆزەکانیم بینی."[1]

ئەم گفتوگۆ زیندووەی کە باس کرا لە نێوان پێغەمبەرو هاوسەرەکەیدا بووە، کە گرنگی پێدان و سنگ فراوانی ئەو نیشان دەدات بەرامبەر بە

---

١- سنن ابی داود، رقم الحدیث: ٤٣٠٥.

خێزانەکانی، لەمەوە تێدەگەین کە ئەگەر لەناو ماڵدا پەیوەندیەکانی ژن و مێرد لەسەر بنەمای (گرنگی پێدان و بەهەندوەرگرتن) ی یەکتر بنیاد بنرێت، ئەوا خۆشەویستی و ڕێز لەو نێوەندەدا بە گوریسی لەبن نەهاتوو لەمێخ دەدرێن.

لەبەرئەوە پێغەمبەری ئازیزمان بۆ بەدەستهێنانی دڵی هاوسەرەکانیو خۆشگوزەرانی و ئاسوودەبوونی ئەوان هەموو هەوڵێکی دەدا، تەنانەت زۆر کات لەگەڵ هاوسەرەکەیدا -خاتوو عائیشە- پێشبڕکێی کردووە، لە بەرچاوی خەڵکیشدا... چونکە زانیویەتی کە ئەم هەڵسوکەوتە بەلای هاوسەرەکەیەوە نیشاندەرێکی گرنگی خۆشەویستییە، بۆیە هیچ کات نکوڵی لێ نەکردووە، لەژیانی پێغەمبەردا ﷺ نموونەی وەکو ئەمە و هاوشێوەی ئەمە زۆرن، ئەو بە تووڕەبوون لە هاوسەرەکانی لە نرخی کەم نەکردوونەتەوە، هەرگیز بە شکاندنیان نەیڕەنجاندوون... هەستیاری پێغەمبەرمان ﷺ بەتەنها لەخاڵی (بەندایەتی) دا کۆببووەتەوە، هەمیشە گرنگی پێدان و هەڵسوکەوتی تایبەتی لەگەڵ هاوسەرەکانیدا بەکارهێناوە، ئەم نموونەیە لەژیانی تایبەتی پێغەمبەرمانﷺ زۆر بەجوانی هەستیاری و نزیکی ئەو لەو ژیانە خێزانیەدا دەخاتەڕوو.

خاتوو عائیشە ئەو کاتەی هاوسەرگیری لەگەڵ پێغەمبەرمانﷺ کرد زۆر گەنج بوو، ڕەفتارو هەڵسوکەوتیش لەو تەمەنەدا ناجێگیرەو هەندێك لە هەڵەو کەم و کورتی لە هەڵسوکەوتدا لەخۆدەگرێت، بێگومان ئەم ڕەفتارانەش لەلایەن پێغەمبەرمانەوەﷺ ڕێکدەخرایەوە.

جارێك خاتوو عائیشە لەپێش پێغەمبەری خوادا لاسایی کەسێك دەکاتەوە، ئەو ڕەت دانەوەیەی پێغەمبەر ﷺ لەبەرامبەر لاسایی کردنەوەکەی عائیشەدا بەبێ شکاندنی دڵی، ڕاستکردنەوەیەکی نموونەیی بوو، کاتێك پێی فەرموو: "دەزانی ئەی عائیشە؟ ئەگەر هەموو دنیاشیان

پێ بدامایە، هەرگیز لاسایی کەسم نەدەکردەوە"، خاتوو عائیشەش لە مەبەستەکەی تێگەیشت، چونکە پێغەمبەرمان ﷺ کردەوە ناشیرینەکانی بەم جۆرە ڕیز دەکرد:

" گاڵتە پێکردن، لاسایی کردنەوە، بانگ کردن بە نازناوی ناخۆش و خراپ، گاڵتە و پێ ڕابواردن بەئیشارەتی چاو و برۆ.."

خاتوو عائیشە کە پەروەردەکراوی ناو سیستەمی پەروەردەیی پێغەمبەرﷺ بوو، پاش کەمێك وتی:

" مرۆڤ نەك لەبەر وتنی وتەیەکی ناشیرین بە برا موسوڵمانەکەی، بەڵکو لەبەر خواردنی پارووییەکی حەڵاڵ دەمی دەشوات، چەند سەیرە!..."، هەم گرنگی بە هاوسەرەکەی دەدات، هەم ڕێگە نادات بکەوێتە هەڵەوە... ئەم نەخشە پڕ لە وردەکاریەی زۆر جوان پاراستووە و بە لێهاتوویی پیادەی کردووە، توانیویەتی هەڵەکان بە ڕێگەی ناڕاستەوخۆو بەبێ شکاندن ڕاست بکاتەوە... ئەم هەست بەرزیە لە هەرماڵێکدا هەبێت، بەبێ گومان ئاسوودەیی و گونجان و خۆشی لەوێدا بەدی دەکرێت.

## نموونەیەکی پەندئامێز

## مرۆڤێکی بەوەفا

ئافرەتێکی پیری بێکەس کە ناوی ئوم ئەیمەن بوو، پێغەمبەرمان بە بەشێك لە خێزانەکەی خۆی دەزانی و، پەیوەندی دایك و فەرزەندی لەگەڵدا بەستبوو، کاتێك قسەی لەگەڵ دەکرد بە" ئای دایە گیان!" بانگی دەکرد، پێغەمبەرمانﷺ هەر کات دایك و برا شیرییەکانی بدیایە، تا

دوائەندازە نزیکی و خۆشەویستی نیشان دەدان، ڕێزی دەگرتن و عەباکەی سەرپشتی پێ دەدان و ڕایەخەکەی خۆی بۆ دادەخستن و، لەماڵەکەیدا بە جوانترین شێوە خزمەتی دەکردن.

پێغەمبەرمان ﷺ بەتەنها لەگەڵ ئەندامەکانی خێزانەکەی خۆیدا، بەڵکو لەگەڵ نزیکەکانی ئەوانیشدا پەیوەندی دەگرت و پشتگوێی نەدەخستن، بەم شێوەیە کاتێك خاتوو عائیشە دەیبینی زیاد لەپێویست گرنگی تایبەتی بە پیرەژنێك دەدا، کە جارجارە سەردانی دەکردن، کە لەهۆکاری ئەمەی پرسی، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: "ئەی عائیشە ئەم ژنە هاوڕێی خاتوو خەدیجەیە، کاتێك ئەو ساغ بوو سەردانی دەکردین، وەفاداری بەرامبەر هاوڕێ لە ئیمانەوەیە." لەبەر گرنگی پێدانی پێغەمبەرﷺ بە هاوەڵەکانی خاتوو خەدیجە، خاتوو عائیشە لەکاتی هەر خێر و قوربانی کردنێکدا بەشێکی بۆ هاوەڵەکانی ئەو دەنارد، ئەنەس رضي الله عنه وەکو قوتابی و کوڕی مەعنەوی پێغەمبەر ﷺ بە تاکێکی ئەو خێزانە هەژماردەکرا، لەبەر ئەوە ئوم سولەیم، دایکی ئەنەس لەلای پێغەمبەر ڕێزو پێگەیەکی تایبەتی هەبوو، ئەو هاوسەرێکی وەفادارو، دۆستێکی وەفادار و پێغەمبەرێکی وەفادار بوو...

# پێغەمبەرمانﷺ کارەکانی ماڵی ڕێك دەخست و هاوکاری هاوسەرەکانی دەکرد

**فەرموودەی پێغەمبەرﷺ**

" تەواوترین ئیماندار لەڕووی ئیمانەوە، ڕەوشت جوانترینیان و باشترینیانە بۆ خێزانەکەی."[1]

**پێغەمبەرمان موحەممەد ﷺ**

هەموو پەروەردەکارەکان، یارمەتیدان و ڕاوێژ پێکردنیان بە گرنگترین بنچینەکانی ئاسوودەیی و خۆشبەختی خێزانی دیاری کردووە، ئەمە لەهەمان کاتدا گرنگی پێدانی هەریەکێکیان بە هاوسەرەکەشی لەخۆدەگرێت. لەکۆمەڵگەی ئێمەدا ئەرکەکانی ژن و مێرد بەگشتی چوارچێوەیەکی دیاریکراو و سنووورداری بۆ کێشراوە، هێشتاش لەبارەی کارەکانی ناو ماڵەوە، داخوازی و دەمەقاڵێکان کۆتاییان پێ نەهاتووە لەبەر هۆکاری چاوەڕوانی خانمەکان لە ئەنجامدانی هەندێك لە ئەرکەکاندا لە لایەن پیاوانەوە بەهەمان شێوە چاوەڕوانی پیاوان لە خانمەکان، ئەمە وای کردووە ناوبەناو گلەیی و دەمەقاڵە دروست ببێت، تەنانەت لەوانەیە

1- سنن الترمذي، رقم الحديث: ١١١٨

زۆرکات ئەمانە بوویێتە هۆکاری جیابوونەوەو تەلاق دان، کاتێکیش لە ژیانی ئازیزمـانﷺ بڕوانرێت، سەرەڕای ئەو هەموو ئەرك و بەرپرسیاریەتیەی سەرشانی، بەشداری کردن لەکاروباری ناومـاڵ و یارمەتیدانی هاوسەرەکانی بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندییان، زۆر بەجوانی دەبینرێت، خاتوو عائیشە خێزانی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ لەبارەی هەڵسوکەوتی پێغەمبەرەوەﷺ دەڵێت: "ئەو هەمیشە لە خزمەتی خێزانەکەیدا بوو، جل و بەرگی دڕاوی خۆی دەدوریەوەو پێڵاوەکانی پاك دەکردەوە "[1]. "هەروەها دەستی دەدایە هەموو کارێکی پێویست، کاتی نوێژیش دەچوو بۆ نوێژەکەی".

هاوکاری و یارمەتیەکانی پێغەمبەرمان ﷺ لەکاری ناو ماڵداو، گرنگی پێدان و خۆشەویستی بەرامبەر هاوسەرەکانی، بۆ ژیانی خێزانی ئەمڕۆمان کاریگەرترین و پڕوانەترین نموونەیە، چونکە ئازیزمانﷺ لە بەرنامەڕێژی کارەکانی ڕۆژانەی خۆیدا، پەروەردەکردنی خێزانی لە پێشەنگی کارو ئەرکەکانیدا داناوە، هۆکارەکەشی ئەوەیە ئەگەر ئاسوودەیی ناو خێزان هەبێت، ئاسوودەیی لە ژیانی ڕۆژانەشدا دەبێت، ئەگەرنا ڕەشبینیەکی گەورە ژیان سەرەوژێر دەکات.

زۆرێك لەو پەروەردەکارانەی کە لەژیانی خێزانی ئازیزمانیان کۆڵیونەتەوە، لەناو خانەوادەی پێغەمبەرداﷺ بەو هەموو خۆشەویستییە زۆرەو ئەو ڕێزگرتنە بێ شومارەی پێغەمبەرمان بەرامبەر هاوسەرەکانی ئاشنابوون کە چەندەها ساڵ بەر لەم ژیانە خێزانییەی ئەمڕۆمان دەکات، چەندین نەخشەو پلان و نموونەی بێ ئەندازەی لەبەرامبەر هەموو

---

١- مسند أحمد بن حنبل، رقم الحديث: ٢٤٣٤٦

بەرپرسیاریەتیەکانی ناو خێزاندا لەخۆگرتووە، کە لێرەدا ئاماژە بە چەند دانەیەکیان دەکەین:

پێغەمبەر ﷺ هەموو ڕۆژێك لەدوای نوێژی عەسر یەك بە یەك سەردانی خێزانەکانی دەکرد، پێویستی و یارمەتی ئەوانی بەجێ دەهێنا، بەمەبەستی ئەوەی هەموو ئەندامانی خێزان بەکۆمەڵ کۆببنەوە پێکەوە، هەموو ئێوارەیەك هاوسەرەکانی کۆدەبوونەوەو ئەو شەوە پێغەمبەری خودا لەلای کێ بمایاتەوە دەڕۆیشتنە ئەوێ بۆ گفتوگۆکردن و پێکەوە مانەوە، بەم شێوەیە خۆشەویستی و یەکگرتووی و پێکەوە بوون تیایاندا بەهێزتر دەبوو. پێغەمبەرمان ﷺ لەناو ئەو گفتوگۆیانەی کە لەگەڵ هاوسەرەکانیدا دەیکرد، کاتێك نۆرەی دەهات، چیرۆکی بۆ دەگێڕانەوە و گاڵتەی لەگەڵ دەکردن و لەناو قسەخۆشەکانیدا وانەی پڕ پەند ڕازێنرابوونەوە، شەویش کاتێك دەچووە ژوورەکەی خۆی یەکەمین کاری پاك کردنەوەی ددانەکانی بە سیواك بوو، لەدوای دەست نوێژگرتن دەچووە ناو جێگەی خەوەکەی و نزاکانی دەکرد، لەپاش کەمێك خەوتن بەخەبەر دەهات و بۆ ئەوەی هاوسەرەکەی بەئاگانەیەتەوە بەهێواشی هەڵدەستا ددانەکانی مسواك دەکردو دەستنوێژی دەگرت و پەرستشەکانی شەوی دەست پێ دەکرد، شەو بوایە یان ڕۆژ، هەر کە لەخەو بەئاگا دەهات، سیواکی ددانە پیرۆزەکانی دەکرد، ڕاوێژی بە هاوسەرەکانی دەکرد، گرنگی بە تێڕوانینەکانی ئەوان دەداو بە بایەخەوە گوێی بۆ بیروبۆچوونەکانیان دەگرت، ئەگەر هەڵەیەکیشیان بکردایە هەوڵی دەدا بەبێ دڵشکاندن بۆیان ڕاست بکاتەوە، لەگەڵ پێغەمبەرایەتیدا، ئەرکی سەرکردایەتی دەوڵەت و فەرمانڕەوایی سوپاشی لەسەر شان بوو، پێغەمبەرمان ﷺ لەناو ئەو ژیانە چڕو پڕ لەئەرکەدا هێشتاش ئەگەر دەرفەتی بۆ برەخسایە خواردنی دروست دەکرد، ناوماڵی پاك دەکردەوەو

خۆی پێڵاو و جل و بەرگی خۆی ڕێك دەخست، لەبەرئەوەی لەپاش نوێژی بەیانی بۆ زوو دەست کردن بە بەجێهێنانی ئەرکەکانی نەدەخەوتەوە، پاش نیوەڕۆ کەمێك دەخەوت، ئەمەش بۆئەوەی وزەیەکی نوێ بەگیان و جەستەی ببەخشێت و کاروبارێکی پڕ بەرهەم جێبەجێ بکات، لەبەرئەوە پشوویەکی بەسوود زۆر پێویست بوو. رسول الله ﷺماڵەکەی تەنها بەجێگەی خواردن و خواردنەوەو شوێنی حەسانەوە نەدەبینی، بەڵکو لەنزیکەوە گرنگی بە پێکەوە ژیانێکی دینیی دەدا لەناو خێزانەکەیدا، خێزانەکانی پێغەمبەریش ﷺ زۆر کات نوێژەکانیان لە مزگەوت بەئەنجام دەگەیاند، بەم جۆرە لە خێرو سوودەکانی نوێژی بەکۆمەڵیش کەڵکیان وەردەگرت.

ئازیزمان ﷺ تا بڵێی لەگەڵ هاوسەرەکانیدا دادپەروەرانە هەڵسوکەوتی دەکرد، بە نەرمونیانییەکی بێئەندازەو، بە خۆشەویستییەوە نزیکیی لەگەڵیان نیشان دەداو زەردەخەنە لە سیمای ون نەدەبوو، لەکاتی نەخۆشی و نارەحەتی هاوسەرەکانیدا، زیاتر بایەخی پێ دەدان و لەلایان دەمایەوە، بەم شێوەیەش جوانترین نموونەی وەفاداری نمایش دەکرد.

پێغەمبەر ﷺ هیچ کات لە ئافرەت و خزمەتکارو هیچ کەسی نەداوە، ئەو کاریگەرییە سلبییەکانی لێدان و توندوتیژی لەناو پەروەردەی خێزانیدا زۆر باش دەزانی، زۆر بایەخی بە پەروەردەو پێگەیاندن و ڕۆشنبیرکردن و پاکوخاوێنی و تەندروستی باش و تەنانەت جل و بەرگی منداڵ و نەوەکانی دەدا، چونکە پێغەمبەر ﷺ گەورەترین پەروەرشیارەو، گرنگی و خۆشەویستی لەناو خێزاندا وەکو دەرمان بەکاریگەرو کارلێکەر دەزانی.

شەوێك کە لەماڵی کچەکەیدا -فاطمە(ڕەزای خوای لێ بێ)- دەمێنێتەوە، کاتێك نەوەکانی -حەسەن و حسین- داوای ئاو دەکەن، بەخێرایی هەڵدەستێت و ئاویان پێ دەدات. بەم شێوەیە پێویستی زوو

بەجێگەیانـدنی داواکارییــە دروســتەکانی منــداڵمان نیشــان دەدات، ئــەم ڕەفتارە لەڕووی باوەڕبەخۆبوون و متمانەی منداڵەوە زۆر گرنگە.

پێغەمبــەرمان ﷺ لەگــەڵ منداڵانــدا گاڵتــەو یــاری دەکــرد، لــەدوای هاوسەرگیری کچەکانیشی، پەیوەندی لەگەڵیان نەدەپچڕاند، پێغەمبــەریش ﷺ وەکو هەموو کەس هەندێك خواردنی لەوانی تر پێ خۆشتر بــوو، بــەڵام ئــەو هــیچ کــات خــواردنێکی بــەخراپ بــاس نــەدەکرد، ئەگــەر بیویســتایە دەیخوارد و ئەگەر پێــی خــۆش نەبوایــە لێــی دووردەکەوتــەوە، ئامۆژگــاری دەکرد کە بەڕێك و پێکی نان بخورێت، دەیفەرموو: "نارێك مەبن، بێگومــان بەرەکــەت لــەنان خــواردنێکی ڕێــك و پێکدایــە"، ئــەم هــەنگاوە ناوازانــەی پێغەمبــەری ئازیزمــان ﷺ لــەبواری پــەروەردەی خێــزان و منداڵــدا وەکــو چــەندین ڕەفتــاری زینــدوو هەڵسوکەوتی گــرنگ لەونێوەنــدەدا بــۆ ژیــانی خێزانی ئەمڕۆشمان ڕێبازو مۆدێلی زۆر کاریگەرن.

دیارە هۆکاری نەگەیشتنی کەسانێك، کــە کــاتی بــەتاڵی دوای کاریــان لەقاوەخانــەو شــوێنە بــێ کەڵکــەکان بەســەر دەبــەن، بەگــەرم و گــوڕی و ئاسوودەیی خێزانی زۆر ئاشکراو ڕوونە.

هــەموو ئەمانــەش گرنگــی و پێویســتی جیاکردنــەوەی کاتــەکانمان بــۆ ڕێکــوپێکی قوتابخانــەی خێــزان و خۆشــبەختی هاوســەر و منداڵــەکانمان فێردەکەن، لەبیرمان نەچێت ئاسوودەیی ناو خێزان نە بــە قــەرز دەدرێــت، نە بەپارە دەستدەکەوێت، تەنها بە تێگەیشتنی هەردوولاو گرنگی پێدان و خۆشەویستی دروست دەبێت، بەهێزترین نموونەش بۆ ئەمــە پێغەمبــەرمان ﷺ نیشانی داوین.

# نموونەیەکی پەندئامێز

## هاوسەرێکی چاکەخواز

پێغەمبەرمان ﷺ لە هاریکاریکردنی هاوسەرەکانیدا چێژی دەبینی، بەشداری کاروباری ناو ماڵی دەکرد و جل و بەرگەکانی دەدووریەوەو پێڵاوەکانی پاك دەکردەوە، کارەکانی لەگەڵ هاوسەرەکانیدا بەش دەکرد. لە گرنگترین بابەتدا تێڕوانینەکانی ئەوانی وەردەگرت، لەهەر دەرفەتێکدا گەورەی دەکردن، لەکاتی دانیشتنیشیان لەسەر سفرە، دەیویست ئەوان سەرەتا دەست پێ بکەن، لەخواردن و خواردنەوەشدا ئەوانی پێش دەخست " بەگوێرەی گێڕانەوەکانی خاتوو عائیشە، پێغەمبەرمان ﷺ لەکاتی هەر ئاو خواردنەوەیەکدا سەرەتا دەیدا بە عائیشە پاشان خۆی دەیخواردەوە، لەکاتی ئاو خواردنەوەشدا سەرنجی دەدا لەو جێیەوە بخواتەوە کە خاتوو عائیشە لێوەی خواردوەتەوە، ئەگەر گۆشتیان بخواردایە ئەو پارچەیەی دەستی خاتوو عائیشەی دەبردو لەو پارووەی ئەو گەستویەتی ئەمیش دەیخوارد"، بەم شێوەیە لە چوونە ناو دڵی هاوسەرەکانیدا سەرکەوتوو دەبوو، کەشێکی ئاسوودەو دڵڕفێنیشی لەنێو خێزانەکەیدا دروست دەکرد.

# پێغەمبەرمانﷺ لەگەڵ هاوسەرەکانی باش دەگونجا، بەشوێن کەمو کورتیدا نەدەگەڕا و ڕێزی دەگرتن

**فەرموودەی پێغەمبەرﷺ**

"موسوڵمان برای موسوڵمانە، نابێت زۆر و ستەمی لێ بکات یان بیدات بەدەست ناحەز و دوژمنی خۆیەوە، یان پشتی لە زەوی بدات، هەرکەسێك مشووری کاری موسوڵمانێك بخوات و بچێت بەدەنگیەوە بەپێی توانا، بۆ جێبەجێبوونی ئەو کارە یاریدەی بدات، خودایش مشووری کاری ئەو دەخوات و لە کاتی پێویستدا دەچێت بە دەنگیەوە"[1].

**پێغەمبەرمان موحەممەد ﷺ**

لەم ڕۆژگارەدا لە دەرگای هەر خانەوادەیەك بدەین، دەبینین بەدەست کۆمەڵێك گرفت و کێشەو نائارامیەوە دەناڵێنین، بۆ ڕەواندنەوەی ئەمانەش بەشوێن چارەسەری جۆراوجۆردا دەگەڕێین، ئەو کتێبانەی دەیانخوێنینەوە، دەروونناسەکان، ڕاوێژکارە خێزانییەکان، پەروەرشیارەکان، تەنانەت پسپۆرانی نەخۆشییە دەروونییەکان... هەر

١- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٢٣٣٠

خێزانێك بەجۆرێك لە جۆرەكان، لەگەڵ هاوسەر بێت یان لەگەڵ منداڵ یان لەگەڵ دەوروبەر كەم تا زۆر لەناو كێشەدا دەژی.

پێغەمبەری ئازیزمانﷺ كە لەگەڵ خێزانەكەیدا وەكو جەستەیەك وابەستەیان بووە، ئازارەكانی ئەوان لەناو دەمارەكانیداو خۆشەویستیان لەدڵیدا هەست پێ دەكات، بەو (خێزانە نموونەیی)یەی كە پێكیهێناوە، هەموو ئەندامەكانی خانەوادەكەی وەكو ئەندامەكانی یەك لاشە كۆكردۆتەوە، بەمانایەكی تر، هەموو دڵەكانی لەناو گیانێكدا یەكخستووە، ئەو نەرم و نیانی و بایەخ پێدان و ڕێزەی كە پێغەمبەرمانﷺ بەرامبەر هەر تاكێكی خێزانەكەی نواندویەتی، ئەوەندە سەرنجڕاكێش و پڕپەندە كە لەم (خێزانە نموونەیی)ەوە وانەو چارەسەری گونجاو بۆ هەموو خێزانێكی دیكە وەردەگیرێت، با لێرەدا چەند نموونەیەك لەوانە باس بكەین:

پێغەمبەرمانﷺ سیاسەتی ڕێزلێنان و گرنگیپێدانی بە هاوسەرەكانی زۆر باش گونجاند بوو، بەم شێوەیەش وردەكاریی ڕێزلێنانی لە مرۆڤەكان فێری هاوسەرەكانی دەكرد، واتە ڕێزلێنانی پێغەمبەرمانﷺ بەرامبەر هاوسەرەكانی لەڕاستیدا نموونەیەكی سەرنجڕاكێشی پەروەردەیی بوو، دراوسێیەكی عەجەمی پێغەمبەر ﷺ خواردنی ئامادەكرد بوو پاشان هاتبوو بۆ بانگهێشت كردنی پێغەمبەرمان ﷺ.

پێغەمبەریشﷺ پرسیبووی:

"عائیشەش بانگهێشت ناكەیت؟"

دراوسێ عەجەمیەكەیشی وتبووی:

" نەخێر تەنها ئێوە بانگهێشت دەكەم"

پێغەمبەری ئازیزمانﷺ بەبێ ڕەنجاندن و ئازاردانی دڵی هیچ كەس وەڵامی "نەخێر"ی ئەو بانگهێشتەی دایەوەو هۆكارەكەشی بەم شێوەیە ڕوون كردەوە:

" ئەگەر عائیشەش بانگهێشت نەکرێت، منیش نایەم"

پێغەمبەرمانﷺ بەم هەڵوێستە جوانەی گرنگی وابەستەبوونی خێزانیمان دەخاتە پێش چاو، لەچاوی ئەودا خێزان وەکو یەك جەستە بوو، کە هەرگیز لێك ناترازێ و بەش بەش نابێت، لەبەر ئەوە بەو بانگهێشتە قایل نەبوو، دیارە دراوسێکەی لەو ڕازە تێدەگات، بۆیە دووبارە دەگەڕێتەوەو بۆ خوانێك بانگهێشتیان دەکات....دیسان پێغەمبەرمانﷺ دەپرسێت:

" عائیشەش بانگهێشت کراوە؟"

ئەویش دەڵێت:" بەڵێ ، ئەویش بانگهێشت کراوە" هەر بۆیە پێغەمبەریشﷺ لەدوای ئەوە لەگەڵ عائیشەی هاوسەری پێکەوە دەڕۆن.

پێغەمبەرمانﷺ ڕۆحی وابەستەبوون و هەستیاری خێزانی زۆرباش تێگەیشتووەو گەورەترین مامۆستا بووە کە نموونەی ئەمانەی بەدرێژایی ژیانی یەك بەیەك نیشان داوە، بێگومان ئێمەش ئەمڕۆ زۆر لە پێویستی ئەمەداین:

سەبارەت بە دانانی پیاو لەپایەی خۆیداو، بەگرنگ تەماشاکردن و ڕێزلێگرتنی... پێغەمبەرمانﷺ بۆ ئەم نموونەیەش لایەنێکی تری گرنگی ژیانی خێزانیمان بۆ ڕوون دەکاتەوە.

جابری کوڕی عەبدوڵڵا ﷺ دەگێڕێتەوە:

پێغەمبەری خواﷺ ڕۆژێ دەستی گرتم و بردمی بۆماڵی خۆی، پارچەیەك نانی بۆ دەرهێنام، فەرمووی: "ئایا پێخۆرێك نییە؟" وتیان: نەخێر جگە لە هەندێ سرکە، فەرمووی: "بەڕاستی سرکە پێخۆرێکی

چاكه". جابر دەڵێت: لەوكاتەوە كە لە پێغەمبەری خوام ﷺ بیستووە ئیتر بەردەوام حەزم لە سركەیە.[1]

ئــەم نموونــە بەرزانــە لــە ڕێزلێنــانی میــوان و گرنگیپێــدان و پێشكەشكردنی ئەوەی لە تواناندا بێت، ئەوەنـدە نموونـەی سەرنجڕاكێشن كە لـەژیانی خێزانیـدا دەبنـە چارەسـەری گـەورەو كاریگـەریی زۆر لەسـەر تاكەكانی خێزان دادەنێن، ئەمە لەكاتێكدا ئەگەر ئەم ڕووداوە لـە ڕۆژگـاری ئەمڕۆمانـدا ڕوویدابایـە، ئـەوا دەبـووە هۆكـاری دروسـت بـوونی چـەندین دەمەقاڵە و، هـەزار جـۆر كـەم و كـورتی دەدۆزرایـەوە و، ڕەخنـە دەگـیراو دڵەكان لەیەك دەڕەنجان. ئەمەش جیـاوازی پێغەمبـەرە ﷺ، هەسـتیاری و دۆزینــەوەی چارەســەری گونجــاو لەلایــەن پێغەمبــەرەوە بــۆ گرفــت دەمەقاڵەكانی نـاو خێـزان كـە بوونەتـە كێشـەی ئـەم ڕۆژگـارە، لەڕاسـتیدا وەكو دەرمان بۆ چارەسەری كێشەكان گرنگن.

صـەفوانی كـوڕی موعەتـەل لەگـەڵ هاوسـەرەكەی شـەڕیان بـوو بـوو هەریەكێكیان هاتبووە لای پێغەمبـەر ﷺ بـۆ سـكاڵاكردن، سـەرەتا خـانم قسەی كردبوو:

" ئەی پێغەمبەری خوا مێردەكەم كە نوێژ دەكەم لـێم دەدات، كـە بـە ڕۆژوو دەبم بـەزۆر پـێم دەشـكێنێت، خۆیشـی تـا خـۆر هەڵنەیـەت نوێـژی بـەیانی ناكـات"، پێغەمبـەرمان ﷺ دوای ئـەو گـوێی بـۆ مێردەكـەی گـرت، صەفوانیش وتی: "ئەی پێغەمبەری خوا كە دەڵێت: (ئەگەر نوێژم كرد لـێم دەدات) بۆ ئەوەیە لەیەك ڕكاتدا دوو سورەتی درێژ دەخوێنێت، مـن لەبـەر خـۆی ئـەوەم لـێ قەدەغـە كـردووەو، دەڵـێم: لەنوێژەكەتـدا یـەك سـورەت بخوێنیت بەسە."

---

١- صحیح المسلم، رقم الحدیث: ٣٩١٧.

صەفوان بەردەوام بوو:

" بۆ ئەوە کە دەڵێت: (ڕۆژووم بەزۆر پێدەشکێنێت.) هۆکارەکەی ئەوەیە کە من کەسێکی گەنجم."

جا پێغەمبەرﷺ ئەو ڕۆژە فەرمووی:

" نابێت ئافرەت بەبێ ڕێگەپێدانی مێردەکەی ڕۆژووی سوننەت بگرێت."

صەفوان بۆ تۆمەتەکەی تری هاوسەرەکەی ڕوون کردنەوەی بۆ پێغەمبەر دا: "بۆ ئەوەش کە تا خۆر هەڵنەیەت نوێژی بەیانی ئەنجام نادەم... من تا خۆر هەڵهاتن بەئاگانایەم".

لەبەرامبەر ئەمەشدا پێغەمبەرﷺ ڕوون کردنەوەی بۆ دان: " ئەی صەفوان ، کەواتە هەر کات بەئاگا هاتیت بەزوویی نوێژەکەت ئەنجام بدە."[1]

پێغەمبەرمانﷺ بەبێ ئازاردان و بریندارکردنی هەستی کەس بەم شێوەیە کێشەی نێوان هاوسەرەکانی چارەسەر دەکرد.

گومانی تێدا نییە لەناو خێزاندا خوازراوترین ڕەفتار تێگەیشتنی بەرامبەر و سنگ فراوانی و گرنگیدان بەیەکترە، مرۆڤ کاتێك لەگەڵ کەسێکی خۆشەویستی دەبێت، لە ڕێزگرتنەکانیدا ئەو سوپاسگوزار دەبێت و نایەوێت بەئازاردان و ڕەخنەلێگرتن کەم و کورتیەکانی نیشان بدرێت، بیر لە ماڵێك بکەنەوە کە تیایدا هەموو هەڵەکان لەسەر خاوەنەکەی هەژمار دەکرێن ، هەموو کەمتەرخەمیەکان دەبنە بابەتی دەمەقاڵەو دەنگە دەنگ، کەم و کورتیەکان بە لێبوردەییەوە نیشان نادرێن و ئەوانەی هەڵەیان کردووە سزا دەدرێن، لەخێزانێکی لەم جۆرەدا لەهەر ساتێکدا بەدڵنیایی

---

١- المستدرك على الصحيحين للحاكم، رقم الحديث: ١٥٣٢

دەمەقاڵەو نائارامی و تەنانەت شەڕیش ڕەنگە دروست ببێت...بەڵام بیر لە خانەوادەیەکی تریش بکەنەوە کە تیایدا هاوسەرەکان یەکتر بریندار ناکەن، ئازاری یەك نادەن و لەنرخی یەکتر کەم ناکەنەوە، بەتەواوی مانا یەکتر لە پێگەی (مرۆڤ) بووندا دەپارێزن و ڕێزی دەگرن، لەخێزانێکی لەم جۆرەشدا ئاسوودەییەکی بێ ئەندازە وجودی دەبێت، بەڵێ پەیوەندی و هەڵسوکەوتەکان لەناو ماڵی پێغەمبەرداﷺ بەم جۆرە بوو، ئەم نموونە جوانانە کە بەزیندووی لەژیانی ئەواندا هەبووە ئێستا لەپێشمانە، ئیدی پێویست دەکات لە دەرگای تر بدەین و لەدووی چارەسەری تر بگەڕێین؟!

## نموونەیەکی پەندئامێز

## چارەسەرێکی تەواو

ئەسمای کچی عومەیس، یەکێك بوو لەو موسوڵمانانەی کۆچیان کردبوو بۆ حەبەشە، بەڵام لەکاتی فەتحی خەیبەردا ئەسماش لەگەڵ موسوڵمانەکانی تر گەڕایەوە، ڕۆژێك ئەسما دەچێت بۆ سەردانی حەفصەی خێزانی پێغەمبەر حەزرەتی عومەریش لەوێ دەبێت، عومەرڕضي الله عنه دەپرسێت: ئەو ئافرەتەی هاتۆتە سەردان کێیە! خاتوو حەفصەش دەڵێت: کچەکەی عومەیسە.

عومەرڕضي الله عنه دەپرسێت: "لە کۆچکردووەکانی حەبەشەیە؟"

حەفصەش دەفەرموێت: "بەڵێ."

عومەرڕضي الله عنه بە ئەسما دەفەرمووێت: " ئێمە پێش ئێوە کۆچمان کرد، لەبەرئەوە ئێمە لەئێوە نزیکترین لە پێغەمبەری خواوە."

ئەسما بەم قسەیەی عومەر توورە دەبێت و دەڵێت:

" نەخێر ، سوێند بەخوا ئەمە ڕاست نییە، ئێوە لەگەڵ پێغەمبەری خوا بوون، ئەو وتاری بۆ داون و لەنەفامیەکانتاندا ئامۆژگاری کردوون، ئێمەش لەو دووریەی حەبەشە بووین ئەمەشمان تەنها لەبەر خواو پێغەمبەرەکەی کرد. "

"سوێند بەخوا تا ئەم قسانەی کە وتت بە پێغەمبەری خوا نەگەیەنم هیچ شتێك ناخۆم و ناخۆمەوە"، کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ هات، ئەسما باسەکەی بەدرێژی بۆ گێڕایەوە، پێغەمبەریشمان پرسی کە چ وەلامێکی ئەسما دراوەتەوە، ئەویش ئەو وەلامەی پێ وت کە داویانەتەوە، پێغەمبەری خواش لەسەر ئەمە فەرمووی:" عومەر لەلای من حەقی لەئێوە زیاتری نیە، عومەر لەگەڵ هاوەڵەکانی یەك جار کۆچیان کرد، لەکاتێکدا ئێوە دووجار کۆچتان کردووە"، کۆچکردووەکانی حەبەشە لەدەوری ئەسما کۆبووبوونەوەو تاوتوێی ئەو وەلامەی پێغەمبەری خوایان دەکرد.

لەدوای ئەوە ئەسما فەرمووی:" هیچ شتێك تا ئەو کاتە بەهێندەی ئەو قسانەی پێغەمبەری ئەکرەم، کۆچکەرانی حەبەشەی دڵخۆش نەکردووە". ئەم وتانە کاریگەریەکی گەورەی لەناو دڵی ئەواندا داناوە، هەربۆیە ئەوان بوونە فیدایی چاونەترس و قارەمانی ئیسلام.

# پێغەمبەرمانﷺ لە هاوسەرەکانی توورە نەدەبوو، خۆشەویستی بۆ دەردەبڕین

**ئامۆژگاری پێغەمبەرﷺ**

**" ئەوەی ڕەحم بکات، خواش ڕەحمی پێ دەکات.**
**ئێوە ڕەحم بەوانەی سەر زەوی بکەن، تاکو ئەوەی لە**
**ئاسمانە ڕەحم بە ئێوەش بکات"[١]**
**پێغەمبەرمان موحەممەد ﷺ**

لەناو ژیانی خێزانیدا یەکێك لەگرنگترین کێشەکانی نێوان هاوسەرەکان، کێشەی بێزارییە لە پەیوەندی خۆشەویستیاندا، لەزۆرێك لە خێزانەکاندا بەهۆی دەرنەبڕینی هەستی خۆشەویستی بۆ هاوسەرو گرنگی نەدان بە درکاندنی ئەو خۆشەویستییە، چەندین کێشە دێتە مەیدان، لەکاتێکدا هاوسەر دەیەوێت بزانێت کە خۆشدەویسترێت و ڕێزی دەگیرێت.

بە بیستنی ئەمە بەڕێژەیەکی زۆر هەست بەگرنگی خۆی دەکات و وابەستەییان بەهێزتر دەبێت پێکەوە، بەڵام دیارە بەهۆی چەند پێشهاتێکەوە هاوسەرەکان خۆشەویستی و گرنگیان بەرامبەر بەیەك نادرکێنن ڕەنگە تەنانەت بە وتنی: "تۆم خۆشدەوێت، تۆ بۆ من زۆر

---

١- سنن الترمذي، رقم الحديث: ١٨٩٦

گرنگیت ، بیر لەخێزانێکی بێ تۆ ناکەمەوە"، هەستەکانیان نەهێننە سەر زمان، بەردەوام سۆزو خۆشەویستیەکەیان لەدەروونیاندا حەشارداوە، ئەمەش بووەتە هۆی ئەوەی هەستێکی نامۆی بۆ دروست ببێت و، لەدڵی خۆیدا بڵێت: "ئاخۆ منی خۆش نەوێت! ؟"...

ئازیزمان زۆرباش ئەم وردەکارییە گرنگەی زانیوەو ئاگاداربووە کە چەندە پێویستە بۆ هاوسەرەکان، بۆیە تاوتاو ئەو سۆزو خۆشەویستیەی بەزمان بێت یاخود بەکردەوە نیشان داون و بەم جۆرەش لەناو دڵیاندا جێی خۆی گرتووە.

جارێك پێغەمبەر ﷺ (عەمری کوڕی عاص) کە تازە هاتبووە ناو ئیسلامەوەو باش لە شێوازەکانی جەنگی دەزانی، بەفەرمانڕەوایی سوپایەکی موسوڵمانان دیاری کرد، لەبەرئەوەی لەناو سوپاکەدا دوو هاوەڵی قارەمان (پێشەوا ئەبوبەکرو پێشەوا عومەر)یش هەبوون، هەڵبژاردنی (عەمری کوڕی عاص) بە فەرمانڕەوای ئەو سوپایە، گفتوگۆو لێدوانی لێکەوتەوە، بێگومان پێغەمبەرمان ﷺ کە یاسای (کار دەدرێت بە کارزان) پەیڕەو دەکات، بۆ ئەم ئەرکەش کەسێکی شارەزا لەبواری تەکنیك و سیاسەتەکانی جەنگدا هەڵدەبژێرێت.

عەمری کوڕی عاصیش بەهەڵبژاردنی بۆ فەرماندەی سوپا، لەناو هاوەڵانی تردا خۆی بەخۆشەویستتر دەزانی، دەگێڕێتەوە: چوومە خزمەتی پێغەمبەرﷺ عەرزیم کرد: ئەی پێغەمبەری خوا! کێ زۆر خۆشەویستە لەلات؟ –عەمری کوڕی عاص وای بیردەکردەوە لەوەڵامدا ناوی ئەو بڵێت، بەڵام زۆر سەرسام بوو بەو وەڵامەی کە وەریگرت–. فەرمووی: "عائیشە". وتم: ئەی لە پیاوان؟ فەرمووی: "باوکی عائیشە...( واتە ئەبوبەکری

صدیق ﷺ)". وتم: لەپاش ئەوان کێی تر؟ فەرمووی:" عومەری کوڕی خەتتاب." هەروەها چەند پیاوێکی تری ژمارد..[1]

عەمری کوڕی عاص بەگوێرەی ئەو وەڵامانەی بۆ پرسیارەکانی وەریگرت، کە تێگەیشت نۆرەی ئەو زۆر لەدواوە دێت، وازی لە پرسیارەکەی هێنا.

دەتوانرێت دوو وانەی گرنگ لەم ڕووداوە دەربهێنرێت:

**یەکەمیان:** ئەرکەکان لەبەرخاتری نزیکی و هاوڕێیەتی و دۆستایەتی نادرێن، بەڵکو پێویستە بەگوێرەی شارەزایی و لێهاتوویی بدرێت.

**دووەمیشیان:** پێویستە مرۆڤ زۆرترین بایەخ بە خێزانەکەی بدات و ئەویش بگۆڕێت بەهێلانەیەك لە بەهەشت و، بتوانێت خۆشەویستیەکەشی لەهەر جێیەکدا بدرکێنێت، گرنگی و پێویستی هەوڵ و تەقەلا بۆ نەشکاندن و ئازارنەدانی هاوڕازو نزیکترین هاوڕێ لە دنیاو ئاخیرەت، لەم لێك نزیك بوونەوە گەرمانەی پێغەمبەری خواوە تێدەگەین.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەرەچێت بۆ سەفەرێك، خاتوو عائیشەش لەگەڵ خۆی دەبات، لەڕێگەدا خاتوو عائیشە ملوانکەکەی ون دەکات، پێکەوە دەست دەکەن بە گەڕان بەشوێن ملوانکەکەدا، لەبەرئەوەی عائیشە زۆر پێی بێتاقەت دەبێت، پێغەمبەرمان نایەوێت بڕۆن تا ملوانکەکە نەدۆزنەوە، لەبەرئەوە بەرەو پێشەوە چوونی سوپاکە دەوەستێنێت و ناچار دەبن لەو ناوچە بێ ئاوەدا شەو بەسەر ببەن، هەندێك لە موسوڵمانەکان کە لەو بارودۆخەدا ناڕەحەت دەبن، دەچنە لای باوکی عائیشە –ئەبوبەکری صدیق– و سکاڵای ئەو ڕەفتارەی عائیشەی لەلا دەکەن.

---

[1]- صحیح البخاري، رقم الحديث: ٣٤٨٣

" دەبینیت کچەکەت چی کردووە؟ هەم پێغەمبەری خەڵەتاند، هەم سوپاکەش... جگە لەوە ئاومان تەواو بووە و دەستنوێژمان پێ ناگیرێت."

ئەبوبەکرﷺ بەوە زۆر تووڕە دەبێت، بەخێرایی خۆی دەگەیەنێتە لای کچەکەی، دەبینێت پێغەمبەر ﷺ کە زۆر شەکەت بووە لەسەر ئەژنۆی عائیشە خەوی لێ کەوتووە.

ئەبوبەکرﷺ لە کچەکەی تووڕە دەبێت:

" دەبینیت چیت کردووە؟ بەهۆی تۆوە سوپا لێرە ماوەتەوە، ئاویش نەماوە بۆ دەست نوێژگرتن"، خاتوو عائیشە باس لەتووڕەبوون و ئازاردانەکەی باوکی دەکات: "باوکم هیچ شتێك نەما کە پێمی نەڵێت، تەنانەت بەدەستیش ئازاری گیانی دام، لەبەرئەوەی پێغەمبەرﷺ لەسەر ئەژنۆم بەئاگا نەیەت هیچ جوڵەم نەکرد".

بێگومان پێغەمبەریش ﷺ تاکو بەیانی لە شەکەتی و بێ ئاویدا خەوتبوو، بەڵام ئەو لە هاوسەرەکەی تووڕە نەبوو، ئازاری نەدا، چونکە ئەو دوو هۆکاری هەبوو، یەکەمیان: هاوسەرەکان بەتەنها بۆ ڕۆژێك نا، بەڵکو بۆ هەمیشە پێویستیان بەیەك هەیە، بۆیە دەبێت لە ناڕەحەتترین کاتدا پێکەوە بمێننەوە، دووەمیشیان: لەو بێ ئاویەدا ئایەتی تەیەموم (دەستنوێژگرتن بەبێ ئاو) دابەزی: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِذَا قُمْتُمْ إِلَى الصَّلاةِ فاغْسِلُواْ وُجُوهَكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ إِلَى الْمَرَافِقِ وَامْسَحُواْ بِرُؤُوسِكُمْ وَأَرْجُلَكُمْ إِلَى الْكَعْبَينِ وَإِن كُنتُمْ جُنُباً فَاطَّهَّرُواْ وَإِن كُنتُم مَّرْضَى أَوْ عَلَى سَفَرٍ أَوْ جَاء أَحَدٌ مَّنكُم مِّنَ الْغَائِطِ أَوْ لاَمَسْتُمُ النِّسَاء فَلَمْ تَجِدُواْ مَاء فَتَيَمَّمُواْ صَعِيداً طَيِّباً فَامْسَحُواْ بِوُجُوهِكُمْ وَأَيْدِيكُم مِّنْهُ مَا يُرِيدُ اللّهُ لِيَجْعَلَ عَلَيْكُم مِّنْ حَرَجٍ وَلَـكِن يُرِيدُ لِيُطَهَّرَكُمْ وَلِيُتِمَّ نِعْمَتَهُ عَلَيْكُمْ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾ (المائدة: ٦). واتە: (ئەی ئەوانەی ئیمانتان هەیە بە خوداو بە پێغەمبەری خودا، ئەگەر ویستتان هەستن بۆ نوێژکردن واتە نیازتان بوو نوێژ بکەن، لەپێشدا دەموچاوو

ڕووخسارتان بشۆرن و ، هەردوو دەستتان بشۆن لەگەڵ ئەنیشکەکانتان و، دەستی تەڕ بێنن بە سەرتاندا. هەردوو پێیشتان بشۆرن لەگەڵ قولەقاپەکانتان. جا ئەگەر لەکاتی هەستان بۆ نوێژدا لەشتان پیس بوو، یانێ جەنابەتتان هەبوو ئەوا خۆتان بشۆرن واتە: هەموو لەشتان چ پێست و چ موو. ئەمە بۆ حاڵێکە کە ئاوتان هەبێ‌و هیچ مانیعێکتان نەبێ لە بەکارهێنانی ئاو. خۆ ئەگەر هەر ئاو نەبوو یا هەبوو و نەتانتەتوانی بەکاری بێنن لەبەر نەخۆشی، یا لە سەفەردا بوون، چ بێ دەست نوێژ بن و چ لەش پیس، یا دەست نوێژتان هەبوو لەپڕ موحتاجی قەزای حاجەت بوون بە میز یا پیسی یا شتی تر کە دەست نوێژ بشکێنێ، یا لە ژنەکانتان کەوتبوون چ بە دەس لێدان و چ بە جیماع کردن و، ئاوتان دەسنەکەوت دەس نوێژی پێ بگرن یا لەشپیسیی خۆتانی پێ دەرکەن، لە هەموو ئەم حاڵانەدا بگەڕێن بە دوای خاکێکی پاکداو دەستانی پیادەن و بیهێنن بە دەم و چاوو ڕوخسارتان و بە هەردوو دەستتاندا تا ئانیشکتان. خودا نایەوێ باری گران بخاتە سەرتان و ناچارتان بکات بۆ بەکارهێنانی ئاو لە هەموو کاتێکدا، بەڵام ئەیەوێ پاکتان بکاتەوە چ بە دەس نوێژو خۆشۆردن و چ بە تەیەمموم و خاك بەکارهێنان. ئەیەوێ نیعمەتی خۆی بەسەرتاندا تەواو بکات، بەشکو شوکرانەبژێریی خودا بکەن و لە فەرمانی دەرچن.)[١]

ئەمە ڕووداوێکی پڕ پەند بوو کە سەرەنجامی باشی ئارامگرتن لەسەر بارودۆخێکی زۆر قورس و بێزارکەر نیشان دەدات، لەمەش زۆر گرنگتر، جارێکی تر خۆشەویستی بە کلیلێکی ئەفسوناوی بۆ دنیا بەیان دەکات.

هیچ گومانی تێدا نییە یەکەمین پەروەردەکارێك کە هاوسەرگیری بە خۆشەویستی هاوسەرەکانی و یەکتر قبوڵ کردنی نێوان ئەوان بەردەوامی

---

١- خولاصەی تەفسیری نامی، ل: ١٠٨

پێ بدات، تەنها پێغەمبەری ئازیزمانەﷺ، ئەو نەگونجانی هاوسەرگیری بەزۆر و بەردەوام نەبوونی ئەو هاوسەرگیرییە لەم نموونەیەدا نیشان دەدات.

ئیبنو عەبباس (ڕەزای خوای لێ بێت) فەرمووی: مێردەکەی بەریرە کۆیلە بوو، ناوی موغیث بوو، کاتێ بەریرە ئازاد بوو خۆی هەڵگرتەوەو نیکاحی خۆیی لە موغیثی مێردی هەڵوەشاندەوە، جا بەم بۆنەیەوە موغیث شوێن بەریرە کەوتبوو، دەگریا و لێی دەپاڕایەوە کە نیکاحەکەی هەڵنەوەشێنێتەوە، فرمێسکی هۆن هۆن بەسەر ڕیشی دا دەهاتە خوارەوە، پێغەمبەرﷺ بەمنی فەرموو: "ئەی عەبباس: نەعەجوب ناکەی لە خۆشەویستی موغیث بۆ بەریرەو لە ڕقی بەریرە لە موغیث؟". پێغەمبەرﷺ بە بەریرەی فەرموو: "بۆچی ناچیتەوە بۆلای؟".

بەریرە وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەمە فەرمانەو پێم دەکەی، دیارە کە فەرمانی تۆ دەبێ جێبەجێ بکێ، یا فەرمان نییەو شتێ ترە؟) پێغەمبەرﷺ فەرمووی: نا، ئەمە فەرمان نییە، بەڵکو تکایە و بۆی دەکەم لەلای تۆ، زۆریی تێدا نییە". بەریرە وتی: کەواتە کارم پێی نییەو تازە ژنێتیی ئەوم قەبووڵ نییە.[1]

پێغەمبەرمان ﷺ لەدوای ئەو وەڵامە ئیتر نکوڵی نەکرد، چونکە ئەگەر خۆشەویستی لەناو هاوسەرگیریدا نەمێنێت، دڵخۆشی و ئاسوودەیش لەو خێزانەدا نامێنێت و، لەدوای ئەوەوە نکوڵی کردن و زۆرکردنیش مانایەکیان نییە.

یەکێك لەو بابەتانەش کە پێغەمبەرمان ﷺ زۆر تیایدا تووڕە بووە دەمەقاڵەو شەڕی ناو خێزان و بەتایبەتیش لێدان بووە، پێغەمبەری

---

١- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٤٩٨١

ئازیزمانﷺ هەرگیز سوکایەتی و ڕەنجاندن و لێدانی بەرامبەر هیچ کەس بەکارنەهێناوە، لەگەڵ ئەوەی خۆی ئەوانەی نەکردووە، ڕێگەی لە ئەنجامدەرانیشی گرتووە، چونکە ئەو دەیزانی لەماڵێکدا لێدان هەبێت، خۆشەویستی دەردەچێت جێیەکیش خۆشەویستی تیانەمێنێ چاوەڕوانی هیچ باشی و جوانیەکی لێناکرێت، جارێك یەکێك سکاڵای ئەوەی کرد کە هاوسەرەکەی جارجار لێی دەدات، ئەویش مێردەکەی بانگ کردو ڕەخنەی لێگرت و لێدانی لێ قەدەغە کرد، لە سکاڵای پیاوانیش بەرامبەر خانمانەکانیاندا هەمان ڕێگەچارەی نیشان دەدان.

بەپێی گێڕانەوەکانی خاتوو عائیشە یەکێك لەهاوەڵان بۆ سکاڵاکردن لە هاوسەرەکەی دێتە لای پێغەمبەرﷺ، پێغەمبەریشمان ئەمەی پێ دەفەرموێت: "بە باشی لەگەڵ هاوسەرەکەت بدوێ، ئەگەر قابیلیەتی هەبێت تێدەگات، ئەگەر نا لێدانی وەکو ئاژەڵ نابێتە چارەسەر". لە هەموو ئەمانەوە زۆر بە ڕوونی لەوە تێدەگەین کە بە شکاندن و هەست بریندار کردن و هەڵسوکەوتی نەخوازراو خۆشەویستی لەناودەبرێت و ژیانی ئەو خێزانە بەرەو دارمان دەچێت.

بۆ بەردەوامی و ئاسوودەیی ژیانی خێزانیش پێویستە هاوسەرەکان خۆشەویستیان بەرامبەر یەك بدرکێنن و گرنگی پێدان و ڕێزگرتنەکانیان بۆ یەکتر دەربڕن و نەیشارنەوە، ڕەنگە ڕۆحی ژیانی خێزانیش هەر ئەمە بێت.

# نموونەیەکی پەندئامێز

## ئاستەنگ

هاوسەری پێغەمبەری خواﷺ، خاتوو عائیشە لەتەمەنێکی منداڵیدا بووبووە بووکی خێزانێکی بەختەوەر، بەتەمەن بچووك بوو بەڵام زۆر زیرەك بوو، وەکو پێویستی ئەو تەمەنەش ئەو پەرۆشی ئەوە بوو ئایا پێغەمبەر خۆشیدەوێت یان خۆشیناوێت!، ڕۆژێك ئەم باسەی لەگەڵ پێغەمبەر کردەوە.

" ئەی پێغەمبەری خوا، تۆ منت خۆشدەوێت؟"

پێغەمبەرمانﷺ زۆر باش لە هەستناسکی هاوسەرەکەی تێگەیشتبوو. بەبێ دوودڵی فەرمووی:

" بەڵێ عائیشە، بێگومان خۆشمدەوێیت".

پەرۆشی و هەستیاری عائیشە لەم وەڵامە کورتەدا جێی نەدەبووەوە.

" ئەی پێغەمبەری خوا چۆن خۆشتدەوێم؟"

پێغەمبەرمان ﷺ ئەمجارە وەڵامێکی زۆر پڕواتای دایەوە:

" وەکو گرێ کوێرە"

خاتوو عائیشەی خاوەن زیرەکی و بلیمەتیی سەرنجڕاکێش لەبەرامبەر ئەو وەڵامەدا سەرسام بوو بوو...

خۆشەویستی وەکو گرێ کوێرە ها؟! چەندین جار دووبارەی دەکردەوە ئەم وشەیەی لەلا بووبووە مەتەڵ... وەکو " گرێ کوێرە"، "گرێ کوێرە" ، ئەم دەربڕینی خۆشەویستییە، بەتایبەت هەڵبژێردراوە، داهێنانێکی پێغەمبەرﷺ بووە، بەمانای خۆشەویستیەکی نەکراوەو پڕ لە

ڕازو لەبن نەهاتوو دێت، (گرێ کوێرە) لە دنیای ڕۆحی خاتوو عائیشەدا دەنگدانەوەیەکی وای هەبوو کە بۆ چەندین جاری تر ژیان لەناو ئەو هەستەدا، ناو بەناو ئەو پرسیارەی لە خۆشەویست دەکردەوە:

" ئەی پێغەمبەری خوا، گرێ کوێرە لە چ جیهانێکدا؟"، پێغەمبەری خواش لەهەموو جارێکدا بۆ ئەوەی هەست بە هەمان خۆشیی بکاتەوە، هەمان وەڵامی دەدایەوە:

" وەکو یەکەمین ڕۆژ.."

## پێغەمبەرمانﷺ ئێرەیی نێوان هاوسەرەکانی بەشیرینی چارەسەر دەکرد

### ئامۆژگاری پێغەمبەر ﷺ

" خوا لە ئافراندنی پیاودا هەستی جیهادکردنی خولقاندووەو، لە ئافرەتیشدا هەستی ئێرەیی بردنی داناوە، هەر ئافرەتێك لەسەر ئەمە ئارام بگرێت، ئەجری شەهیدی دەست دەکەوێت"[١]

**پێغەمبەرمان موحەممەد ﷺ**

یەکێك لەو پێویستیانەی وای کردووە پێغەمبەرمانﷺ لەگەڵ چەند ئافرەتێك هاوسەرگیری بکات، بۆ ڕێکخستن و بنیاتنانی ژیانی دروستی کۆمەڵایەتی بووە، هەر خانمێکیان بەپێی تواناو مەرجەکانی تایبەت بەخۆی ئەرکی گرنگی پێ سپێردراوە، هەمووشیان ئافرەتی سەنگین و بەڕێز بوون، پێغەمبەرمان ﷺ کەڵکی لە تایبەتمەندی هەریەکە لە هاوسەرەکانی وەردەگرت بۆ خزمەتی ئیسلام، بەدەربڕینێکی تر، هەر یەکێك لە هاوسەرەکانی جوانیەکی جیاوازی ئیسلامی هەڵگرتووەو تەمسیلی دەکات، بەمەش هەموویان دەبنە وەسیلە بۆ گەیاندنی پەیامی زۆر گرنگ بە موسوڵمانان، لەگەڵ ئەوەشدا هەروەك چۆن لەهەموو ماڵێکدا

---

١- المعجم الكبير للطبراني، رقم الحديث: ٩٨٥٠

کێشە بوونی هەیە، لەماڵی پێغەمبەریشدا هەندێك کێشە دروست دەبوو، پێغەمبەری ئازیزمان کە لە هەموو بوارەکاندا پێشەنگە بۆ ئوممەتەکەی، لە کاتی دروستبوونی ئەو کێشانەشدا هەم خۆی دەبووە چارەسەر، هەم چارەسەری نیشانی ئەوانی تریش دەدا، چونکە بەڕێوەبردنی ماڵ کاری هەموو موسوڵمانێکە، بۆ بەئەنجام گەیاندنی ئەمەش بەباشترین تەرز، گرتنەبەری ڕێبازو بەرنامەی پێغەمبەر ﷺ پێویستە، لەبەرئەوە بابەتە خێزانیەکان و چارەسەرەکانیان لەلای پێغەمبەر ﷺ لەناو موسوڵمانانندا ڕەنگی دەدایەوەو، ئەویش پەندو وانە وەرگرتنی ئەوانی دەویست وەك ئەوەی لە زۆرێك لە ماڵەکاندا بوونی هەیە، لەناو خێزانی پێغەمبەریشدا دیارترین کێشە ئێرەیی بردن بوو.

باسی ئێرەیی بردن کە یەکێکە لە گرنگترین لاوازییەکانی هەر مرۆڤ و خێزانێك و تەنانەت هەر کۆمەڵگەیەك، لەناو هاوسەرەکانی پێغەمبەریشدا جاروبار خۆی دەردەخست، ڕەنگە خوای گەورە خەسڵەتی ئێرەیی بردنی وەکو پەندوەرگرتن و بوون بە نموونە بۆ موسوڵمانان، لەناو خێزانی پێغەمبەریشدا بەرجەستەکردبێت.

پێغەمبەرمان موحەممەد ﷺ وەك هەموو کێشەیەکی تر، لەبابەتی ئێرەیی بردنیشدا لێکدانەوەی بەسوود و پڕپەند و چارەسەری گونجاو و پڕحیکمەتی بەکاردەهێنا.

لە چارەسەری ئەم کێشەیەشدا بەبێ دڵ ڕەنجاندن و بەوریایی و زیرەکانە کاری دەکرد، بەم شێوەیە خانمەکان هەم هەستیان بە هەڵەکانیان دەکرد، هەم هەستیان بریندار نەدەبوو، پێغەمبەر ﷺ کاتێك داواکاری لە ئوم سەلەمە کرد، ئوم سەلەمە دوودڵی نواند، دیارە دوودڵی ئوم سەلەمەش لەبەرئەوە بوو کە هاوسەرەکانی پێغەمبەر لە تەمەندا

منداڵتر بوون و هەندێکیشیان لەو جوانتر بوون، بۆ ئەم ئەندێشەیەی ئوم سەلەمە ، پێغەمبەر ﷺ بە دوعاکردن ئەو هەستەی دەرەواندەوە:

"ئەگەر ئیرەیی بە هاوسەرەکانی ترم دەبەیت، خوا ئەو ئیرەییەت لەسەر بڕەوێنێتەوە". پێغەمبەرمان لەدوای فەتحی خەیبەر لەگەڵ (صەفیە) کە کچە یەهودیەك بوو، هاوسەرگیری کرد، خانمەکان کە هەواڵی جوانی ئەویان بیست چوون بۆ بینینی، خاتوو عائیشەش بۆ ئاگادار بوون لە بارودۆخەکە، ڕۆیشت بۆ بینینی صەفیە، پێغەمبەری خواش کە لەنیەتی خاتوو عائیشە تێگەیشتبوو، دواتر لەو بارەیەوە پرسیاری لێ کرد:

"صەفیەت چۆن بینی؟"

خاتوو عائیشەش بەهەستی ژنانەی خۆی وەڵامی دایەوە:

" وەك یەهودییەك بینیم.."

پێغەمبەری خواش عائیشەی ئاگادارکردەوە:

" بەم شێوەیە قسە مەکە... ئەو موسوڵمان بووە."

هەروەها لەدوا نەخۆشکەوتنی پێغەمبەری خوادا کە صەفیە دەیوت:

" ئەی پێغەمبەری خوا! وەڵاهی حەزم دەکرد لەجێی تۆ من نەخۆش بوومایە."

خانمەکانی تر بەو نزیکی نیشان دانەی صەفیە ئیرەییان بردو چاوەکانیان بەرامبەر یەك دەجوڵاند، پێغەمبەری خواش کە تێبینی ئەو ڕەفتارەی هاوسەرەکانی کرد زۆر ناڕەحەت بوو، پێی فەرموون: "بەزوویی داوای لێخۆشبوون لە خوا بکەن".... هاوسەرەکانیشی لە هۆکاری ئەوەیان پرسی ، پێغەمبەریش ﷺ پێی فەرموون: " لەبەر ئەو چاو جوڵاندنەتان بۆ یەکتر... ئەو لەقسەکەیدا دڵسۆز بوو.."

ئەگەر چی جاروبار ئیرەیی بردن و غیرە لەنێوان هاوسەرەکانی پێغەمبەردا ڕووی دەدا، بەڵام هیچ کات لەنێوان یەکتریدا قسەی خراپیان

بەیەك نەدەوت و قسەی هەڵبەست و بوختانیان بۆ یەكتر دروست نەدەكرد، خاتوو عائیشە كە هەندێك جار لە توندی ئێرەیی پێ بردنیدا لەگەڵ زەینەب " تفی ناو دەمی وشكی كردووەو وەڵامی پێ نەدراوەتەوە"، بەڵام لەباسی زەینەبدا دەفەرموێت: "لەنێوان هاوسەرەكانی پێغەمبەری خوادا، زەینەب ئەو ئافرەتە بوو كە لەهەموویان زیاتر لەگەڵ من كێبڕكێی بوو، زۆر گفتوگۆو دەمەقاڵەمان بووە، لەگەڵ ئەوەشدا من ئافرەتێكی دیكەم وەكو زەینەب خێركەرو بەهێندەی ئەو لەخواترس و ڕاستگۆ و خزم دۆست و بەخشندە، هەروەها دڵسۆز بۆ كارو ئەركەكانی نەدیوە"، زەینەبیش كە بەردەوام لە ڕكابەری خاتوو عائیشەدا بوو، لەبارەی ئەوەوە ئەمانە دەڵێت:

" من پەنا بەخوا دەگرم لەو شتەی نەمدیبێت و بڵێم دیومە، لەوەی نەمبیستبێت و بڵێم بیستومە، سوێند دەخۆم لە بارەی عائیشەوە جگە لە خێر شتێكی تر نازانم".

پێغەمبەرمان ﷺ بەم جۆرە باسی سیفەتی ئێرەیی بردنمان لەئافرەتاندا بۆ دەكات:

" خوا لە ئافراندنی پیاودا هەستی جیهادكردنی خولقاندووە و، لە ئافرەتیشدا هەستی ئێرەیی بردنی داناوە، هەر ئافرەتێك لەسەر ئەمە ئارام بگرێت، ئەجری شەهیدی دەست دەكەوێت."

بۆ ئەو ئێرەییە جۆراوجۆرانەی بەهۆكاری جیاواز لەناو خێزانەكاندا دروست دەبن، پێغەمبەرمان لێكدانەوەو چارەسەری زۆر وردو گرنگی هەبووە.

# نموونەیەکی پەندئامێز

## ئێرەیی و سەرئەنجامەکەی

صەفیە خاتوون ئافرەتێك بوو کە خواردنی زۆر جوان ئامادە دەکرد، بۆیە خاتوو عائیشە لەبارەیەوە وتویەتی:" لەژیانمدا نەمدیوە کەسێك بەم شێوەیە خواردن باش ئامادە بکات"، ڕۆژێك پێغەمبەر ﷺ لە ژوورەکەی عائیشەدا دەبێت خاتوو صەفیە قاپێك خواردنی بۆ دەنێرێت، لەکاتێکدا خاتوو عائیشە ڕازی نەدەبوو کاتێك پێغەمبەر لە ژوورەکەی ئەودا بوو هیچ شتێك لە هاوسەرەکانی دیکەیەوە قبوڵ بکات، لەبەر ئەوە هاتنی ئەو خواردنە لە هاوسەرێکییەوە کە بەو جوانییە ئامادەی کردبوو خاتوو عائیشەی بێزار کردبوو، خاتوو عائیشە کە بەرگەی ئەو بارەی نەگرتبوو، لەدەستی ئەو خزمەتکارەی دابوو کە خواردنەکەی هێنا بوو، پێی ڕشتبوو، دوای ئەوەش بۆ ئەوەی کاریگەری ئەو ڕەفتارەی خۆی لەسەر پێغەمبەری هاوسەری ببینێت، تەماشای ڕووی ئەوی کردبوو، لە سیمای پێغەمبەردا تووڕەییەکی زۆری بەدی کردبوو. خاتوو عائیشە بەم جۆرە دەیگێڕێتەوە:

" لەوکاتەدا هەستم بەغیرەو ئیرەییەکی زۆر کرد، ڕۆیشتم و قاپەکەم شکاند، دواتریش پەشیمان بوومەوە، پێغەمبەری خواش زۆر بەوە تووڕەبوو."

خاتوو عائیشە کە دەرکی بەو کارە هەڵەیەی خۆی کرد، یەکسەر چووە لای پێغەمبەرو داوای لێخۆشبوونی کردو وتی:" پەنا دەبەمە بەر نێردراوی خودا تاکو ئەمڕۆ قسەیەکی خراپم پێنەڵێت"

پێغەمبەری خوا کە هەڵەکان ناداتەوە لەڕووی هیچ کەس، هەستاو پارچەکانی قاپە شکاوەکە و خواردنە ڕژاوەکەی کۆکردەوە، چونکە ڕژانی خواردنەکە شتێك بوو کە صەفیەی پێ ناڕەحەت دەبوو، لەبەرئەوە ئەم ڕەفتارەی پێغەمبەرمان ﷺ پەیامێك بوو بۆ صەفیە تاکو بەو شێوەیە بێزاربوون و ناڕەحەت بوونی لەسەر ئەو ڕووداوە بۆ دەربخات، پێغەمبەرمان لەلایەك خواردنەکەی کۆدەکردەوە، لەلایەك بۆ هێورکردنەوەی ئەوانەی دەوروبەری فەرمووی:" بخۆن... دایکتان غیرەی داکرد... بخۆن... دایکتان ئێرەیی برد!" خاتوو عائیشە کە بەهەڵەکەی خۆی زانی، تا بڵێی پەشیمان بوو، بە پێداگرییەکی زۆرەوە پرسیاری چۆنیەتی لێخۆشبوونی لە پێغەمبەرمان کردبوو، وەڵامی پێغەمبەریشمان تا بڵێی پڕ بوو لە وانەو پەیام بۆ مرۆڤایەتی:

" خواردنێك وەکو خواردنەکەی ئەو، دەفرێك وەکو دەفرەکەی ئەو"[١]...

---

١- مسند أحمد بن حنبل، رقم الحديث: ٢٥٧٩١

# پێغەمبەرمانﷺ لەگەڵ هاوسەرەکانی گاڵتەی دەکرد، گفتوگۆی دەکرد و ئەوانی ئاسوودە دەکرد

**ئامۆژگاری پێغەمبەرﷺ**

" نەرم و نیانی و قسەی خۆش لەهەر جێیەك بێت جوانی دەکات، لەهەر جێیەك نەبێت ناشیرینی دەکات."

**پێغەمبەرمان موحەممەد ﷺ**

لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا چرپوپری کارەکان زۆر زیادی کردووەو، پەیوەندیەکانی نێوان ئەندامەکانی خێزان کەمی کردووە و کاتەکان پەرتەوازە بوون، بۆیە هاوسەرەکان بۆ دۆزینەوەی کاتێکی گونجاو تاکو لەدەوری یەك کۆببنەوەو گفتوگۆبکەن و بە ئارامی تاوتوێی کێشەو بارودۆخەکانی ڕۆژانەیان بکەن، دەبێت بەردەوام وێڵی فرسەت و هەلی گەورەبن . بەبێ هیچ گومانێك ئەو کەسەی کە ئەمەی زۆر باش لێکداوەتەوە پێغەمبەرمانەﷺ، بۆ بەدەستهێنانی دڵی هاوسەرەکانی و ڕێزگرتنیان و گوێ گرتن بۆ کێشەکانیان و چوونە ناو دونیای ڕۆحانی ئەوانەوە بەپێکهێنانی "گفتوگۆی خێزانی" گرنگترین شێوازی پەروەردەو ئاگادار بوون لەحاڵی ئەوانی پەیڕەو کردووە.

پێغەمبەرمان ﷺ سەرەڕای کارو بەرپرسیاریەتیە زۆرەکانی گفتوگۆی خێزانی پشتگوێ نەخستووە، چونکە لە وانەدان بە قوتابخانەی

خێزانیدا هەرگیز نابێت کەمتەرخەمی بکرێت، پێغەمبەرمان ﷺ لە چوار لایەنەوە ئەندامانی خێزانەکەی پەروەردە دەکرد:

یەکەمیان: لەگەڵ هاوسەرەکانیدا دەدواو دانە دانە لەسەر کێشەکانیان رادەوەستا.

دووەمیان: پێکەوە لەگەڵ هەموو هاوسەرەکانیدا گفتوگۆی دەکرد.

سێیەمیان: کاتێك ئافرەتانێك بۆ هەندێك پرسیاری تایبەت بە خانمان یاخود کێشەی خێزانی بە میوانی دەهاتنە لای ئەویش هاوسەرەکانی بانگ دەکرد و بەدەرفەتی دەزانی بۆ ئەوەی ئەوانیش سوود وەربگرن.

چوارەمیان: کاتێك لە ماڵ یاخود لە مزگەوت نوێژی ئەنجامدەدا، هاوسەرەکانیشی بانگهێشت دەکرد تا لە گفتوگۆکانی دوای نوێژ کە دەکرا سوود وەربگرن.

وەك دەبینرێت ئەو هەمیشە لەخەمی ئەوەدا بووە هاوسەرەکانی وەکو قوتابی لە پەروەردەکردندا بن، چونکە ئەو وانەیەی بە کەسێك دەوترێتەوە، پەیوەندی تایبەتی بە ژیانی خێزانیەوە هەیە، ژیانێکی نموونەیی لەخێزاندا، رۆڵی لەوە گرنگترە کە خەریك بێت تێڕوانینی خەڵکی دەرەوە ڕازی بکات، پێغەمبەری نازداریش کە ئەمە لەهەگبەی زانستیدا هەبوو، هەستیاریەکی تایبەتی بەرامبەر وانەکانی قوتابخانەی خێزانی نیشان دەدا.

پێغەمبەرمانﷺ بەسەربردنمی شەوەکانی لەگەڵ هاوسەرەکانیدا بەشێوەیەکی بنەڕەتی یەکلاکردبووەوە، ئەویش بەپێی ئەو تیرو پشکەی شەوەکانی دیاری کردبوو بە لەبەرچاوگرتنی نۆرەکانیان هەر شەوەو لەلای یەکێکیان دەمایەوە، هەموو بەیانیەك لەدوای هاتنەدەری لە مزگەوت و هەموو عەسرێك لەپاش ئەنجامدانی نوێژەکەی دانە دانە سەردانی هاوسەرەکانی دەکردو گوێی بۆ داواکاریەکانیان دەگرت و دڵەکانیانی ڕازی

دەكردو وەكو مامۆستا وانەی نوێی پێ دەدان، لەپێناو پاراستنی یەكێتی و پێكەوەبوونی ئەندامانی خێزانەكەی هەموو شەوێك هاوسەرەكانی كۆدەبوونەوەو دەچوونە ئەو ماڵەی ئەو شەوە پێغەمبەری لێ دەمایەوەو پێكەوە گفتوگۆیان دەكرد، لەم كۆبوونەوانەشدا پێغەمبەری ئازیزمان بەتەنها باسی گرنگ و جددی نەدەكردەوە بەڵكو چیرۆكی پڕ پەندو گاڵتەو قسەی خۆشیشی بۆ دەگێڕانەوە، پەروەرشیاری ڕۆژئاوایی (جۆن دیۆی) بەم شێوەیە نهێنی وابەستەیی و گرنگیپێدان و هاوسۆزی نێوان موسوڵمانان ڕووندەكاتەوە:

" دنیای ئیسلام بەهۆی ئەوەی كە خاوەنی پەروەردەكارێكی وەكو موحەممەدن زۆر بەختەوەرن، ئەو بنچینەی خێزانی ئەوەندە جوان داڕشتووە كە تاكەكانی ناو ئەو خێزانە بە نیەتی عیبادەت كردن یەكتریان خۆشدەوێت و تەنانەت لەپێناوی یەكتردا دەمرن، دنیای مەسیحیەتیش لەماددەدا دەوڵەمەندن بەڵام موحتاجی ئاسوودەیی و ئارامین، چونكە ئەوان موحەممەدیان نییە"

بەڵێ ئێمە پێغەمبەر موحەممەدﷺمان هەیە گومانی تێدا نییە زۆر خۆشبەختین، بەڵام لەبنەڕەتدا خۆشبەختی ڕاستەقینە ئەوەیە كە لەسەر تێڕوانین و بیركردنەوەكانی ئەو بۆ ژیان، پلانی ژیانمان دابڕێژین.

پێغەمبەرمان گفتوگۆكانی دوای ئێوارەی لەناو ڕێكخستن و كەشێكی پڕ لە كاریگەری و بەبەرهەمدا دەبردەسەر، لەناو ئەمانەشدا لەبەرئەوەی هاوسەرەكانی هەست بەبێزاری نەكەن، بەجۆرێك هونەری گاڵتەكردن و قسەی خۆشی بەكاردەهێنا.

لە گفتوگۆی ئێوارەیەكیاندا، كاتێك پێغەمبەرمانﷺ وانەی بە خێزانەكانی دەدا، خاتوو عائیشەو حەفصە لەناو گەرموگوڕی و شەوقیاندا كەمێك لە سوعبەت ڕۆیشتنە دەرەوەو بە خاتوو صەفیەیان وت: "كچی

یـەهودی، ئێمـە لـە تـۆ زیـاترین، چـونکە ئێمـە هاوسـەر و کچـەمامی پێغەمبەرین ﷺ"

خاتوو صەفیە بەمە زۆر ناڕەحـەت بـوو، بـەو شـێوازەی کـە بنەچـەی یەهودی بوونی ئەویان دایەوە لە ڕووی و ئەمـەش لای ئـەوانی تـر بچـووکی دەکردەوە، زۆر خەفەتی خوارد".

پێغەمبەری ئازیزمان کە ئەمـەی بیسـت وەکـو هەمیشـە بەگرتنەبـەری ڕێگەچارەیەکی ژیرانـە چـووە نێوانیانـەوە و بـەبێ شـکاندنی هـیچ کامیـان چارەسەری کرد.

" ئەی صەفیە تۆش لەوەڵامـدا پێـت بوتنایـە: "منـیش هاوسـەرەکەم پێغەمبەر موحەممەدە، باوکم هاروون –هـاروون پێغەمبـەر– و مـامم موسـا –موسا پێغەمبەر– بێت، ئێوە چۆن دەتوانن لە من زیاترین؟"

دیسان بەیانیـەکیان پێغەمبـەرمانﷺ عـەلی کـوڕی ئـەبوتالیبﷺ بـۆ نـانی بـەیانی بـانگکردبوو، هـەروەها کچـەکەی و خـاتوو عائیشـەش ئامـادەبوون، لـەو ژەمـەی بەیانیانـدا زەیتونیـان هـەبوو پێغەمبـەری خـوا لەگەڵ خواردنی زەیتونەکاندا ناوکەکەی دەردەهێنا بەشاراوەیی دەیخسـتە بەردەمی حەزرەتی عەلی ، دوای ماوەیەك ناوکـەکانی بـەردەمی حـەزرەتی عەلی زۆر بوون، پێغەمبەری خوا بەگاڵتەوە بەحەزرەتی عەلی فەرموو:

" ئەی عەلی چەندە زۆرت خواردووە ! "

حەزرەتی عـەلیش بـەوتنی: "ماشـەڵلا ئـەی پێغەمبـەری خـوا! تـۆش بەناوکەکەوە خواردووتە، سەیری بـەردەمت بکـە هـیچ نـاوکی لـێ نییـە.." وەڵامی گاڵتەکەی پێغەمبەری دایەوە.

عەسرێك لە دوای نوێژ، ئافرەتێك بۆ داواکاریەك هاتـە مـاڵی پێغەمبـەر ﷺ پێغەمبەریش ﷺ کە حـاڵی تـووڕەیی و گـرژی ئافرەتـەکەی بینـی بـۆ

ئاسوودەکردن و دڵدانەوەی گاڵتەیەکی لەگەڵ کرد، بەپێکەنینەوە لە ئافرەتەکەی پرسی:

" تۆ خێزانی ئەو پیاوەنیت کە سپیایی لەچاویدا هەیە؟"

ئافرەتەکە زۆر سەری سوڕما، نەیزانی چی بڵێت، دوای کەمێك وتی: "پێغەمبەری خوا، هاوسەرەکەی من سپیایی لەچاویدا نییە!"

پێغەمبەریش فەرمووی:" لەچاوی هەموو مرۆڤێکدا سپیایی دەبێت هەبێت".. بەو شێوەیە ئافرەتە پیرەکەی خستە پێکەنین.

لەڕووداوێکی تریشدا دیسان ڕەهەندە پەروەردەییەکان لە ناو سوعبەتەکانی پێغەمبەردا ﷺ دەبینین، ڕۆژێك خاتوو عائیشە شۆربای ئامادەکردبوو خاتوو سەودەشی بانگهێشت کردبوو، بەڵام خاتوو سەودە نەیویستبوو بخوات، هەرچەندە خاتوو عائیشە پێداگیری کردبوو، هەر نەیخواردبوو، عائیشەش شۆرباکەی خستبووە ناو مشتی و لە ڕووخساری خاتوو سەودەی هەڵسووبوو، پێغەمبەری خواش ﷺ لەبەرامبەری ئەو دیمەنەدا زەردەخەنەکەی پێ ڕاگیرنەکرابوو، بەڵام خاتوو سەودە زۆر ناڕەحەت بوو بوو.

پێغەمبەریشمان ﷺ بۆ ڕەواندنەوەی ئەو گرژیەی دروست بووبوو، بەهێمای چاو خاتوو سەودەی تێگەیاند بوو کە ئەویش هەمان کاری بەرامبەر بکاتەوە، خاتوو سەودەش کە بەوە غیرەت گرتبووی و شۆرباکەی لەناو مشتی نابوو لە ڕووخساری خاتوو عائیشەی هەڵسوو بوو، پێغەمبەری ئازیزیشمان ﷺ بەرامبەر بەو لێکناڵانە لەگاڵتەو جددیات، لەنێوان دوو خێزانەکەیدا خۆی لەبەر پێکەنین پێڕاگیرنەکرابوو.

بێگومان پێویستە لەناو ماڵدا ڕێژەو چەندێتی گاڵتەو پێکەنینەکانیش ڕێکبخرێت، دەموچاوێکی مۆن و، ڕووخسارێکی جددی و سیمایەك کە هیچ زەردەخەنەی تیانەبینرێت چەندە بارودۆخێکی تاڵ دروست دەکات،

بەسوعبەت گرتنی هەموو شتێك و هەمیشە ڕەفتاری گاڵتەئامێزیش بەهەمان شێوە بارێکی ناهەموار دروست دەکات، پێویستە لەبیرنەکرێت کە هەر ڕەفتارێکی دایك و باوك لەناو ماڵدا ڕێبازو نموونەیە بۆ منداڵەکانیان، لەبەرئەوە پێغەمبەرمان ﷺ زۆر بە باشی چۆنێتی و چەندێتی جددیات و گاڵتەکانی زانیوە، لەکاتی گاڵتەکردنیشدا هەرگیز زیادەڕۆیی و قسەیەکی دوور لەڕاستی نەکردووە.

## نموونەیەکی پەندئامێز

### پەروەردەیەکی شیرین لە ماڵی پێغەمبەردا ﷺ

بێگومان گاڵتەو قسەی خۆش و گفتوگۆو بیروڕا گۆڕینەوەو پێکەوە شاندانەبەر کێشەو ناڕەحەتیەکان لەناو ژیانی خێزانیدا، ئەو ماڵە دەکات بە هێلانەیەکی پڕ لە ئاسودەیی و پێکەوە ژیان، لەکاتێکدا ئەو خێزانانەی کە تیایدا ئەندامەکان لێك پچڕاوو سیماکان لەیەك توورەن و ماڵیش وەکو ئوتێل بەکاردەهێنرێت و کەسیش هەستیاری و بەرپرسیاریەتی بەرامبەر ناڕەحەتیەکانی ناو خێزان نیشان نادات، ماڵەکانیان دەبێت بە شوێنگەی ئاژاوەو بەیەکداهەڵپرژان بەجۆرێك کە هیچ کام لە ئەندامەکانی خێزان هەست بەدڵخۆشی ناکەن، کەسانی زاناو پسپۆڕی بواری خێزانیش ئەوە دەخەنەڕوو کە گاڵتەکردن و قسەی خۆش لە شوێن و کاتی خۆیدا لەنێوان ئەندامەکانی خێزاندا بەشێوەیەکی بەرچاو ،بارودۆخە گرژەکان دەڕەوێنێتەوەو بێزاری و ناڕەحەتیەکان کەم دەکاتەوەو ئارامی دەگەڕێنێتەوە.

گەورەترین پەروەرشیارو مامۆستای مرۆڤایەتیش موحەممەد ﷺ ئەو کەسە بووە کە گاڵتەو قسەی خۆشی وەکو ئامرازێکی بەهێز بۆ پەروەردەکردن و ڕاگرتنی پێگەی خێزان بەکارهێناوە، ئەم نموونە زیندووەش زۆر جوان ئەمەمان بۆ دەخاتەڕوو:

ئافرەتێکی پیر جاروبار بۆ پرسیارکردن دەهاتە لای پێغەمبەرﷺ، ڕۆژێك دووبارە هاتە ماڵی پێغەمبەری خوا ﷺ بەپێغەمبەری وت:

" ئەی پێغەمبەری خوا، دوعام بۆ بکە تاکو بچمە بەهەشت"، پێغەمبەری خواش بەگاڵتەوەو لە فەرمایشتێکی پڕ لەماناد‌ا فەرمووی:

" ژنە پیرەکان ناچنە بەهەشتەوە."

ئافرەتەکە پیرەکە بەم قسەیە زۆر ناڕەحەت بوو دەستی کرد بە گریان، هەستاو ویستی بڕوات، ئینجا پێغەمبەری خوا ﷺ حیکمەتی قسەکەی خۆیی بۆ ڕوون کردەوە:

" ناڕەحەت مەبە ، دەزانیت کە ژن و پیاوەکان بەپیری ناچنە بەهەشتەوە بەڵکو گەنج دەبنەوە لەبەهەشتدا، لەبەر ئەوە پیرەکان ناچنە بەهەشتەوە"، ناڕەحەتی و دڵتەنگی ئافرەتە پیرەکە لەناکاو گۆڕا بەدڵخۆشی.

# پێغەمبەرمانﷺ
# بەرامبەر هاوسەرەکانی زۆر ئارامگر بوو

### ئامۆژگاری پێغەمبەرﷺ

" ئارامگرتنی قبوڵ کراو، ئەو ئارامگریەیە کە لەسەر
کێشەو نارەحەتی بیگریت"..
پێغەمبەرمان موحەممەد ﷺ

ئارامگری سەرچاوەی ئاسوودەیی خێزانە، ئەو کەسانەی دەتوانن بەسەر خۆیاندا زاڵ بن و کۆنترۆڵی خۆیان پێدەکرێت و لە وەڵامدانەوەدا پەلە ناکەن و ئارامگرن لەڕووبەڕووبوونەوەکاندا بێگومان ماڵەکانیان پڕ لە کەشێکی شیرینی ژیانی خێزانیە ، هاوسەرەکانی ناو ئەو خێزانانەش کە توانای گرتنەوەی هەستی تووڕەییان نییەو بەهەموو شتێك دەمارگیرو تووڕە دەبن، بێگومان هیچ کات شەڕو ئاژاوە لەناویاندا تەواو نابێت.

بێگومان پێغەمبەری نازدار لەم بوارەشدا ڕێنیشاندەرو سەرمەشقانەو بەرەو ئارامگری ئاڕاستەمان دەکات، چونکە مرۆڤی ئارامگر هەمیشە براوەیە و لەژیانیدا سەرکەوتووانە بە چەندین ئەزموونداتێپەڕیوە.

پێغەمبەری ئازیزمانﷺ لەبەرامبەر کردەوە و ڕەفتارە نەشیاوەکانی هاوسەرەکانیدا هەمیشە ئارامی گرتووەو بەشیرینی و خۆشی وەڵامی

داوەتەوە، هەرگیز لێدان و قسەی دڵشکێنەری بەکارنەهێناوە، نموونەی ئارامگری لە ژیانی پێغەمبەرماندا زۆرن هەمووشیان ڕێبازو نموونەی دیارو پڕ پەندن.

ڕۆژێك ، ئەبوبەکری صدیق رضي الله عنه باوکی خاتوو عائیشە هاتبووە ماڵی پێغەمبەر ﷺ لە ژوورەوە دەنگی کچەکەی (خاتوو عائیشە)ی بیستبوو کەوا بەسەر پێغەمبەردا بەرزی کردۆتەوە، هەر بە چوونەژوورەوەی ویستبووی زللەیەك لەکچەکەی بدات، بەڵام پێغەمبەری خوا چوو بووە نێوان و ڕێی لێگرتبوو، بەمەش ئەبوبەکری صدیق رضي الله عنه بەتووڕەیی و نارەحەتییەوە لەوێ دەرچووبوو، کاتێك باوکی خاتوو عائیشە لەماڵ چووبووە دەر پێغەمبەری خواش ڕووی لە عائیشە کردبوو بەئاراستەکردنی دوو پەیامی گرنگ فەرمووبووی:

" بینیت ، تۆم لە دەست باوکت ڕزگار کرد..."

یەکێك لەپەیامەکان: جێنەبوونەوەی لێدان و توندوتیژییە لەناو ژیانی خێزانیدا، دووەمیشیان: پێویستی پشت گرتن و پێکەوە بوونی هاوسەرەکانە لەهەموو بارودۆخێکدا.

شایەتحاڵی ڕووداوەکە ئەبوبەکری صدیق رضي الله عنه، کە ئەو خۆشەویستی و ئاشتەواییە زۆرەی نێوان پێغەمبەری خواو کچەکەی بینیبوو وتبووی: "وەك ئەوەی منتان بەشداری شەڕەکەتان کرد، بەشداری ئاشتیەکەشتانم بکەن". پێغەمبەری خواش فەرموبووی:" کردمان...کردمان.."[1].

پێغەمبەرمان وەك لەم ڕووداوەدا بەئارامگری و ئاشتەواییەوە بەرامبەر خاتوو عائیشە وەستابووەوە، هەر بەوجۆرە لە پەیوەندیەکانی لەگەڵ هاوسەرەکانیدا هیچ کات هەستی تووڕەیی دەرنەبڕیوەو ڕووداوی بچووکی

---

١- سنن أبي داود، رقم الحديث: ٤٣٦٨

گەورە نەكردووە، هەمیشە ئارامگری بەیەكەم هەنگاوی چارەسەر بینیوە چونكە ئارامگرتن وەكو كۆڵەكەی ناو ماڵ وایە، هەركەس باوەشی پیابكات، بەدڵنیاییەوە بە ئەنجامێكی ئیجابی دەگات.

لەنێوان هاوسەرەكانیدا، لە هەموویان زیاتر خاتوو عائیشە ڕیوایەتە گرنگەكانی پەیوەست بە پێغەمبەری ﷺ گێڕاوەتەوە، خاڵی گرنگ و پێویستی لەژیانی تایبەتی و هەڵسوكەوتەكانی ناو ماڵی پێغەمبەری بۆمان ڕوون كردۆتەوە لەنێوان ئەوانەشدا (ئارامگرتنی) هەمیشەو بەردەوامی پێغەمبەرﷺ.

خاتوو عائیشە دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری نازدارمان تەنانەت لە ناڕەحەترین بارودۆخدا، بەبێ ئاخ و ئۆف كردن و بەئارامگریەوە ڕەفتاری كردووەو بەبێ شكاندنی كەس و زۆركردن و پێشێلكاری چارەسەری حاڵەتەكەی كردووە، جا ئارامگری لە ئاڕاستەكردنەكانی ئیمان و قورئاندا بووبێت، یاخود لە بەندایەتی و پەرستشەكاندا، یاخود لە كاروباری ناو ماڵدا، پەروەردەكردنێكی كاریگەری دوای خۆی جێ هێشتووە، چونكە ئەو هەر لەكاری ناو ماڵەوە تاكو كاروبارەكانی دەوڵەت، هەمیشە بەئارامگریەوە ڕەفتارو بەریەككەوتنی لەگەڵ ڕووداوەكاندا هەبووە هەربۆیە هەمیشە سەرئەنجامی سەركەوتن و بردنەوە بووە. پێغەمبەری ئازیزمانﷺ، بەهاوكاری كردنی لەكاری ناوماڵدا لەگەڵ خێزانەكانیدا، وەك دوورینەوەی جل و بەرگەكانی، پاككردنەوەی پێڵاوەكانی و دۆشینی مەڕو هەروەها یارمەتیدانی خزمەتكارەكانی لەكاتی هەڵگرتنی كەلوپەلدا كە لەبازاڕ دەیانكڕی، بەم شێوەیە بۆتە جوانترین نموونەی پڕ پەندی ئارامگری ، لەلایەكی تریشەوە هاوەڵان لەچەندەها ڕووداوگەلی تردا باس لە ئارامگری پێغەمبەری خوا دەكەن لەگوێگرتن بۆ داواكاری هاوڵاتیان و ڕێزگرتن و گرنگیدانی زۆری بە میوانەكانی، (عەدی كوڕی حاتەمی طائي)

که بەدەوڵەمەندی ناسرابوو، هاتبووە مەککە بۆ زیارەتی پێغەمبەر ﷺ وا پێشبینی کردبوو کە لەگەڵ حاکمێکی گەورە ڕووبەڕوودەبێتەوە، چونکە هەموو عەرەبستان کەوتبووە ژێر فەرمانی پێغەمبەرەوەﷺ، کە چووبووە مەدینە، پێغەمبەری خوا بانگهێشتی کردبوو بۆ ماڵەکەی خۆی، لەڕێگەدا کە ڕێۆشتبوون بینیبووی کە پێغەمبەری خوا ﷺ بەئارامییەوە بۆ ماوەیەکی زۆر گوێی بۆ پێویستی پیرەژنێك گرتبوو، کە گەیشتبوونە ماڵەوەش عەدی لەسەر دۆشەکێکی لۆکەی نەرم دانیشاندبوو خۆیشی لەخوار ئەوەوە لەسەر زەویەکە دانیشتبوو، عەدی کە ئەو خاکێتیەی پێغەمبەری بینیبوو وتبووی:

" وەڵاهی خاوەنی ئەم ئارامگری و خاکی بوونە، حاکمێك نییە، بەڵکو دەبێت پێغەمبەر بێت..." لەدوای هەموو ئەمانەوە تێدەگەین کە لەناو ژیانی خێزانیدا بۆئەوەی کاروبارەکان بەڕێکوپێکی بەڕێوەببرێن و کێشەکان بە شێوەیەکی تێگەیشتوانە چارەسەربکرێن، پێویستمان بە ئارامگرتن هەیە، هەروەك پێویستە لەساتی هەڵسەنگاندنی ڕووداوەکان و، لەکاتی پەروەردەکردنی منداڵەکاندا و لەکاتی چارەسەری کێشەکاندا تەنها بیر لەو کاتانە نەکەینەوە، بەڵکو بیر لە داهاتوو و سەرئەنجام بکەینەوەو، بەئارامگریەوە هەڵسوکەوت بکەین.

# نموونەیەکی پەندئامێز

## ئارامگرتن گەورەترین چارەسەرە

ئـەوەی (عومـەری کـوڕی خـەتاب)یش ﷺ لـەبارەی ژیـانی خێزانـی پێغەمبەرەوە بۆمان دەگێڕێتەوە، تێڕوانینی زۆر کاریگەرن بۆ چارەسـەری کێشە خێزانیەکانی ئەمڕۆمان:

دراوسێیەکم هەبوو، بەنۆرە دەچووینە سەردانی پێغەمبـەر ﷺ ڕۆژێـك ئـەو دەچـوو، هـەواڵی لای پێغەمبـەری پێدەگەیانـدم، ڕۆژی دواتـر مـن دەچووم و هەواڵی ڕۆژانەم بۆ ئەو دەهێنایەوە، ڕۆژێك ئەو دراوسێیەم هـات و زۆر بەخێرایی لە دەرگاکەمی دا، بەزوویی چوومە دەرەوە، بەپەرۆشیەوە وتی: "ڕووداوێکی گرنگ هەیە.."

منیش وتم:" بێ بڕواکان هێرشیان کردووە؟"

وتـی: "لـەوەش گـەورەتر... پێغەمبـەری خـوا لـە هاوسـەرەکانی جیابووەتەوە..." یەکسەر لە دڵی خۆمدا وتم: "ئای حەفصـەی کچم دۆڕا، چـاوەڕێی ئەمـەم دەکـرد". هەسـتام و ڕۆشـتمە لای حەفصـەی کچـم... دەگریا... حەزرەتی عومەر، ناڕەحەتی و غەمگینی لە هاوسەرەکانی تـری پێغەمبەری خواو ئەو هاوەڵانەشدا کە ڕووداوەکـەیان بیسـتبوو، دەبینێت، بۆ تێگەیشتن لە ناوەڕۆکی کێشـەکە، دەیـەوێت پێغەمبـەری خـوا ببینێت، بەڵام ڕێگەی پـێ نادرێـت، دواتـر دیسـان هـەوڵ دەدات، ئـەمجارە دەگاتـە حضوری . دوای ئەوەی کە تێدەگات پێغەمبـەری خـوا لـە هاوسـەرەکانی جیانەبووەتەوە، ئارام دەبێتەوەو لەپاشاندا دەڵێت:

"ئەی پێغەمبەری خوا، ئێمە دەناسیت، ئێمەی قورەیشیی گەورەی ژنەکانمان بووین کاتێك هاتینە مەدینە، لێرە بینیمان کە ژنەکان گەورەی پیاوەکانن، ژنەکانی ئێمەش لەوانەوە ئەو خووەیان وەرگرتووە."

ڕۆژێك لە هاوسەرەکەم تووڕەبووم کە بەرامبەرم وەستابووەوە منیش ئەوەم بەدروست نەزانی و ئازارم دا، کەچی پێی وتم بۆچی ئازارم دەدەیت؟ وەڵاهی هاوسەرەکانی پێغەمبەریش بەرامبەر ئەو دەوەستنەوە، تەنانەت ئەوان ئەگەر بەپێویستی بزانن خۆیشیان عاجز دەکەن و بەدرێژایی ڕۆژ پێغەمبەری خوا بەجێ دەهێڵن".

بەحەفصەی کچم وت: "تۆش بەرامبەری پێغەمبەری خوا دەوەستیتەوە؟" حەفصەش وتی: "بەڵێ، هیچ کاممان ئەو ڕۆژە تا شەو ناچینە لای".

پێم وت: "هەرکەس لە ئێوە ئەوە بکات، زیان بەخۆی دەگەیەنێت و لە دۆڕاوەکان دەبێت، کێ لە ئێوە دڵنیایە کە بەتووڕەو بێزارکردنی پێغەمبەر ﷺ نەکەوێتە بەر تووڕەیی خوای گەورە؟ خوا دەزانێت، لەکاتێکدا پەرێشان دەبن، حەفصەی کچمم ئاگادارکردەوە:" هەرگیز بەرامبەر پێغەمبەری خوا نەوەستیتەوە و کارێکی بێزارکەرت لێ نەوەشێتەوە". لەپاشان حەزرەتی عومەر دەڵێت:

" کە من ئەمانەم دەوت، پێغەمبەری خوا زەردەخەنەی دەکرد"، پێغەمبەری نازدار کە هەمیشە بەسنگ فراوانی و ئارامگریەوە بەرەنگاری هەموو ڕووداوێك دەبووەوە، بناغەیەکی لە ئاسوودەیی و جیهانی خۆشبەختی داکوتاوە کە تا قیامەت بەردەوام دەبێت.

ئێستا ئیتر زۆر باش لەوە تێدەگەین کە ئارام گرتن گەورەترین ڕێگەچارەیە لەبەرامبەر کێشەکانی ژیانی خێزانیدا.

# بەشی دووەم

## ماموستایەتی پێغەمبەرمان موحەممەد ﷺ لە پەروەردەکردنی منداڵدا

ئەگەر لە شێوازی منداڵ پەروەردەکردنی پێغەمبەری خوا ﷺ بکۆڵرێتەوە ئەوا هۆشمەندترین و هاوچەرخترین و باشترین ڕێبازی پەروەردەکردن دەبینرێت. ئەو کەسانەی خۆیان بە کاریگەر دەزانن لەبواری پەروەردەی منداڵاندا، پێویستە ماموستایەتی پێغەمبەرمان موحەممەد ﷺ قبوڵ بکەن و خۆیان بەو پەیڕەوە گونجاو و کاریگەرەی ئەو ببێون، ئەگەر نا مەحکومی ڕێبازێکی پەروەردەیی دواکەوتوو دەبن. لەوە زۆر باش تێدەگەین کە وەك هەموو مەیدانەکانی تر لەپەروەردەی منداڵیشدا گەورەترین پەروەردەکاری کاریگەر موحەممەدە ﷺ .

پرۆفیسۆر دکتۆر صباح الدین زعیم

## پێغەمبەرمانﷺ خۆشەویستی بێ سنووری بۆ منداڵان نیشان دەدا

**ناوەڕۆکی پەروەردەیی**

**" ئەوەی میهرو سۆزی بۆ منداڵان نەبێت، لە ئێمە نییە."**

**پێغەمبەرمان موحەممەد ﷺ**

باشترین زانا بەوەی کە هەوێنی خۆشەویستی منداڵانە، گومانی تێدا نییە کە پێغەمبەری ئازیزمانەﷺ، ئەو زۆر باش دەیزانی ئەگەر سۆزو ئەوین بە منداڵ بدرێت، ئەوا هەست بە بوون و گرنگی خۆی دەکات، بێگومان ئەو منداڵەی خۆشەویستی پێ ببەخشرێت ئەوا ئەویش ڕەفتارو کرداری شیاو و قبوڵ کراو لای دەوروبەری دەنوێنێت.

بەڵام منداڵ کە ببینێت بایەخی پێ نادرێت، خۆشەویستی و میهرەبانی پێشکەش ناکرێت، تێگەیشتنی "کێشەی من نییە" لە دەروونیدا چەکەرە دەکات و باوەڕبەخۆبوونی ئەو دەڕوخێنێت، لە دەرەنجامی ئەمەشدا دەست دەکات بە هەڵسوکەوت و خووڕەوشتی نەشیاو لەناو خێزان و دەوروبەردا، لەبەر ئەوە پێغەمبەرمانﷺ دەفەرمووێت: "ئەوەی میهرو سۆزی بۆ منداڵان نەبێت، لە ئێمە نییە"، بەمەش دەردەکەوێت کە چەندە سەرنجی بەخشینی خۆشەویستی بە

منداڵان داوە و دایکان و باوکانی لە سۆزو گرنگیدان بە منداڵان ئاگادار کردوەتەوە.

پەروەردەی دەربڕینی خۆشەویستی بۆ منداڵان ئەوەندە پڕ پەندو حیکمەت و کاریگەرە، کە لەڕووی دەروونی و منداڵناسییەوە ناوازەو بێ کەم و کورتییە.

با لە چەند نموونەیەکەوە لەو پەروەردەکردنە پڕ لە خۆشەویستیەی پێغەمبەرمانﷺ کە نزیکترینە بە کێشەکانی ئەمڕۆی ئێمە، تێبگەین.

نەوەکانی پێغەمبەر ﷺ حەسەن و حوسەین هاتبوونە مزگەوت ئەوان باپیرەیان زۆر خۆشدەویست و بێ ئەو هەڵیان نەدەکرد، لەو کاتەشدا پێغەمبەر ﷺ لە وتاردا بوو، ئامۆژگاری هاوەڵانی دەکرد وەختێ نەوەکانی بینی دەهاتنە ژوورەوە وتەکانی لەنیوەدا بڕی و لە مینبەرەکەی هاتە خوارەوە، حەسەن و حوسەینی لەئامێز گرت و ماچی کردن، ئەم دیمەنە لەپێش چاوی ئامادەبووانی مزگەوتدا بوو بە دەرس و وانەیەکی گرنگ لە پەروەردەی منداڵدا، چونکە ئەم بابەتە جددیترین و گرنگترین کارە کە پێویستە لەبیر نەکرێت.

ئەگەر لە پانتایی پەروەردە پڕ لە سۆزەکەی پێغەمبەرمانﷺ بڕوانین وردەکاریی زۆر گرنگ دەربارەی پەروەردەکردنی منداڵانی ئەم ڕۆژگارەشی تیادا بەدی دەکەین.

یەکێك لە تێڕوانینەکانی ئەنەسیش‌ﷺ ، هەستیاری و وردبینی پێغەمبەری خوا بووە لەپەروەردەکردنی منداڵدا، پێغەمبەرمانﷺ کاتێك لەمزگەوتدا نوێژی بەئەنجام دەگەیاند، نەوەکانی -حەسەن و حوسەین- هاتن و چوونە سەر شانی پیرۆزی پێغەمبەرﷺ، ئەو ئازیزەش تاکو ئەو کاتەی خۆیان لەسەر پشتی پیرۆزی دانەبەزین سەری لە سوجدە

بەرزنـەكردەوە، هـاوەڵان كـە بـەم دیمەنـە سـەریان سـوڕما، پرسـیان: "پێغەمبەری خوا سوجدەتان زۆر درێژ نەكردەوە؟!"

وەڵامی پێغەمبـەری نازدارمـان وانەیـەكی پـڕ لـە پەنـدە بـۆ دایكـان و باوكان و پەروەردەكاران:

" پەلەم نەكرد، بۆ ئەوەی منداڵەكان نەكەون."

زوبەیریش ﷺ لەم بابەتەدا شایەتێكی ترە:

" ڕۆژێك بەچاوی خۆم بینیم، كاتێـك پێغەمبـەرﷺ لەسـوجدەدا بـوو، حەسەن هاتوو، چووە سەر پشـتی تـاكو ئـەو منداڵـە خـۆی لەسـەر شـانی دانەبەزی پێغەمبـەری خـواﷺ داینەبەزانـد، كـاتێكیش پێغەمبـەر لەنوێـژدا بـەپێوە بوایـە، قاچـەكانی دەكـردەوە حەسـەن لەلایەكیانـەوە دەهـات و لەلاكەی ترەوە دەڕۆیشت"

عەبـدوڵڵای كـوڕی مەسـعودیش بەگێڕانـەوەكانی، خۆشەویسـتی بـێ شوماری ئەومان بۆ منداڵان بۆ دەردەخات:

" پێغەمبەری خوا ﷺ كاتێك نوێـژی دەكـرد، لـە سوجدەدا بـوو كـە حەسەن و حوسەین دەهاتن و دەچوونە سەر پشتی وەختێ ئەوانەی لـەوێ ئامادەبوون دەیانویسـت ڕێگـەیان لێبگـرن، بـەڵام پێغەمبـەری خـواﷺ بـە ئیشارەت پێـی دەوتـن كـە وازیـان لـێ بهێـنن"، ئـەم چەسپاندنانە سۆزو میهرەبانی زۆری پێغەمبەری خوامانﷺ بەرامبـەر منـداڵان نیشـان دەدات، بێگومـان یـەكێك لـەگرنگترین هۆكارەكـانی خۆشەویسـتی بەخشـین و سـۆزداریە بەرامبـەریان، ئـەو منداڵانـەی بـەم جـۆرە گەشـە دەكـەن، لـەداهاتوودا دەبنـە مایـەی خێـرو خۆشەویسـتی بەخشـینەوە بەوانـەی چواردەوریان دیارە كە ناوەڕۆكی ئاشتەوایی و ئارامی لە كۆمەڵگەشدا هـەر ئەمەیە.

نموونــەکان گــەلێك زۆرن لــەبارەی خۆشەویســتیو ســۆز بەخشــینی پێغەمبەری خوا ﷺ بەرامبەر منداڵان و کردنەوەی دڵی بۆ ئارامکردنــەوە و لەئامێزگرتنیان، چەند وانەیەك لەوانە دەخەینەڕوو چونکە پەروەردەکارانی ئەم سەردەمە زۆر پێویستیان بەم هەڵســەنگاندانەی پێغەمبــەری مامۆســتا هەیە.

دایکی شیریی حوسەینی نەوەی پێغەمبەر ﷺ خانمێـك بـووە بەناوی ئـوم فاضـیل بـاس لـە دڵ فراوانــی و هەســت ناســکی و میهرەبـانی زۆری پێغەمبەرمان ﷺ بۆ دەکات.

" ڕۆژێـك شـیرم دەدا بــە حوســەین، رسـول الله ﷺ هاتــە لام داوای منداڵەکەی کردو منیش پێم دا، منـداڵ یەکســەر پیایـدا ڕشـایەوە، دەسـتم درێژکرد تاکو لێی وەربگرمەوە، بەڵام ئەو فەرمووی: "پێـی مـەبڕە، واز لـە منداڵەکە بهێنە" پاشان داوای پەرداخێك ئاوی کردو ڕشتی بەو شوێنەدا کە منداڵەکە تەڕی کردبوو.

لەلایەکی تریش پێغەمبەر ﷺ هەرگیز نەیدەویست منداڵەکان بگریێن، خۆشەویستی دڵی ئـەو کـە هــەموو گــەردوون لـە ئـامێز دەگرێـت، بەرگـەی گریانی منداڵێك ناگرێت.

جارجــارە خانمــەکانی ئاگــاداردەکردەوە:" منداڵــەکان مــەگریێنن"، تەنانـەت ئـەوەش کـە لـە ژێرکردنـەوەی منـداڵێکی گریـاودا فەرموویـەتی و بەمانایە:

" هەرکەس خۆی ببەخشێت لەوەی منداڵە گریاوەکـەی ژێـر بکاتــەوە، خــوای گــەورە ئەوەنــدەی دڵــی بیــەوێت لەبەهەشــتدا نیعمــەتی پــێ دەبەخشێت".

کاتێك لە مزگەوت نوێـژ دەکرا و ئافرەتـانێکی منداڵداریش لـە نوێـژە بەکۆمەڵەکەدا بوون لەبەرئەوەی کـە منداڵـەکان نـەگرین نوێژەکـەی کـورت

دەکردەوەو کاتی دەدا بە دایکەکان تاکو سەرقاڵی منداڵەکانیان بن. لە ژیانی پێغەمبەری سەروەرماندا، وردەکاری زۆر پڕ حیکمەت لە پەروەردەکردنی منداڵاندا دەبینین، بەتایبەتیش لەوە تێدەگەین کە پەروەردەکردنی منداڵان بە خۆشەویستییەوە، لە هەر بارودۆخێکدا بێت، لەخۆبوردنێکی پێویست و گرنگە. لەدوای دەرکەوتنی هەموو ئەو جوانیانەش، پێویستە کە بەخۆماندا بچینەوەو هەڵسەنگاندنێك بکەین و بپرسین: ئێمە چەندە توانیومانە زەمینەسازی بۆ خۆشەویستی منداڵەکانمان بکەین؟!

## نموونەیەکی پەندئامێز

### منداڵەکان ماچ بکەن

لەبارەی سۆز بەخشین و گرنگیپێدانی پێغەمبەرەوەﷺ دوو نموونەی جوان هەیە کە هەردووکیشیان ڕووناکی دەبەخشنە پەروەردەی سەردەمی ئەمرۆمان.

**نموونەی یەکەم:**

ڕۆژێك پێغەمبەری خوا ﷺ چوو بووە لای عوسمانی کوڕی مەظعون، عوسمان منداڵێکی لەلابوو کە خەریك بوو ماچی دەکرد، پێغەمبەر ﷺ لێی پرسی:

" ئەو منداڵە هی خۆتە؟ "

" بەڵێ."

" ئەی عوسمان، ئەوت خۆش دەوێت؟"

" بەڵێ وەڵاهی یارسول الله ، زۆرم خۆشدەوێت."

" ئەو خۆشەویستیەی بۆ ئەو هەتە زیادی بکەم؟"

" بەڵێ، دایك و باوكم بەقوربانت بێت."

" هەركەس لەنەوەی خۆی منداڵێكی بچووك ڕازی و دڵخۆش بكات، خوای گەورە لە قیامەتدا ئەو دڵخۆش و ڕازی دەكات."

**نموونەی دووەم:**

عائیشە دەگێڕێتەوە: عارەبێكی دەشتەكی هات بۆلای پێغەمبەرﷺ عەرزی كرد: ئێوە منداڵانی خۆتان ماچ دەكەن؟ ئێمە شتی وا ناكەین و منداڵی خۆمان ماچ ناكەین! ! پێغەمبەرﷺ پێی فەرموو: جا من دەسەڵاتی چیم هەیە بۆت؟ تۆیە كە خودا خۆی ڕەحمی لەدڵت سڕیوەتەوە، من دەسەڵاتی چیم هەیە بۆت.[١]

١- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٥٦٥٨

# پێغەمبەرمانﷺ بەشداری یاریکردنی منداڵانی دەکرد و لەگەڵ ئەواندا سەرقاڵ دەبوو

**ناوەڕۆکی پەروەردەیی**

" ئەوەی منداڵی هەیە، با لەگەڵیدا خۆی منداڵ بکاتەوە."

**پێغەمبەرمان موحەممەد ﷺ**

خۆمنداڵ کردنەوە لەگەڵ منداڵدا و چوونە ناو دنیای ئەوانەوە بۆ فێرکردنی ڕەوشت و ڕەفتاری شیاو، لە جوانترین نموونەکانی پەروەردەیە لە ژیانی ئازیزماندا ﷺ، بەشداریکردن لە گەمەی منداڵەکانداو، یاریکردن لەگەڵیان و خۆنیشاندان وەکو یەکێك لەوان، هەستی متمانەو باوەڕبەخۆبوونیان تیا بنیات دەنێت و دڵەکانیان بەدەست دەهێنرێت، ئەمەش دەبێتە یارمەتیدەر بۆ وێناکردنی ڕەفتاری جوان و بەسوود لەناو منداڵەکاندا، بۆیە پێغەمبەری ئازیزمان وەك فەرمان بەپەروەرشیارەکان دەفەرموێت: " ئەوەی منداڵی هەیە، با لەگەڵیدا خۆی منداڵ بکاتەوە" ، بەر لەوەی بچینە ئەو باسەوە کە چۆن پێغەمبەری ئازیزمانﷺ چووەتە ناو دنیای منداڵانەوەو چۆن لەگەڵیاندا خۆی منداڵ کردووەتەوە، با تیشکێك بخەینەسەر پێویستی منداڵ بە " یاری و گەمە" و فێرکردنی ژیان و تێگەیاندنی هەندێ لە ڕاستیەکان و دروستکردنی خووە جوانەکان لە منداڵاندا لەگەڵ یاریدا لە گرنگترین ڕێگەو شێوازەکانی پەروەردەکردنە، چونکە منداڵ بە چاوی یاریکردن و گەمە تەماشای جیهانی دەوروبەری

دەكات و دەیناسێت، ئامرازێكی ڕەنگینترو كاریگەرتر لەیاری و گەمە بۆ فێركردنی منداڵ نییە، چونكە یاری وەك چۆن كاریگەری لەسەر گەشەی فیزیكی و كۆمەڵایەتی و هەستیاری منداڵ هەیە، لەهەمان كاتدا برەو بە پێگەیشتنی زەینی منداڵیش دەدات، منداڵ بەم مانایە لە یاریكردن تێر نابێت، گەمەو یاریكردن لە دنیای منداڵدا، دەركككردنی خودو بەرفراوانكردنی توانای داهێنان و بەسەربردنی كاتیش بەشێوەیەكی باش دەپارێزێت، هەروەها دەشبێتە چارەسەر بۆ هەندێك لە تێكچوون و پێكدادانەكان لە پەیوەندیەكانی نێوان دایك و باوكدا دەبێتە دەراسایەكی گرنگ بۆ پێكهاتنەوەیان، منداڵ لە یاریكردندا فێری تێگەیشتن دەبێت، خۆی دەناسێت، دەگات بەماناكانی ژیان و باوەڕبەخۆبوون، منداڵ لەكاتی یاریكردندا لاسایی زۆرێك لەو كەسانەی دەوروبەری خۆی دەكاتەوە، ئەمەش بۆ ئەزموونی ژیانی زەمینەی لەبار دەڕەخسێنێت، یاری وێنای ژیانی داهاتوو بۆ منداڵ دەكات، چونكە یاری یەكەمین و سەرەتاییترین ناوەندی فێربوونە لای منداڵ بەو شتانەی دەیان بینێت و دەیان بیستێت، وەریان دەگرێت و تاقییاندەكاتەوە، خاڵی پەیوەندی لەنێوان ئەوانەدا دروست دەكات كە فێری بووە، ئەمەش گرنگی و سوودی یاریكردنمان لەلای منداڵ بۆ ڕوون دەكاتەوە.

یاری دەبێتە بەشدارییەكی گرنگی منداڵ بۆ دەرخستن و بەرفراوانكردنی تواناو وزە فیزیكیەكانی، هەروەها لە دروست كردنی پەیوەندی كۆمەڵایەتی لەگەڵ دەوروبەری و ناسینی هاوڕێی تازەو ڕێكخستنی بەریەككەوتنەكانی لەگەڵ كۆمەڵگەدا ڕۆڵێكی گرنگی هەیە و، ئەزموونی پێویست بۆ چارەسەری كێشەكانی لەپەیوەندی لەگەڵ دایك و باوك و خوشك و براكانی دەهێنێتە بەرهەم، فێری دەكات كە نەك تەنها بەچاوی خۆی، بەڵكو بەچاوی ئەوانی تریش لە ڕووداوەكان بڕوانێت.

هەروەك پێوەری هەست بەرزی لە قسەکردن و هەڵسوکەت کردن و کڕین و فرۆشتندا فێر دەکات. هەروەها کاریگەری یاری لەسەر ڕەواندنەوەی ترس و دڵەڕاوکێ و شەرم و خۆبەدوورگرتنی منداڵ زۆر گەورەو ناوازەیە، لە پلانداناو و ڕێکخستن و ئاڕاستەکردنەکانیشدا بۆ دیاریکردنی حەق و ڕاستی یاریکردن دەوری کاریگەری خۆی هەیە، منداڵەکان بە زمانی یاری و گەمەکانیان، ویست و خواست و دەربڕینەکانیان لە دەروونیان دەهێننە دەرەوە.

پێغەمبەری نازدارمانﷺ کە یاریکردنی لەجیهانی منداڵدا بە ڕێگەیەکی گرنگ و کاریگەر بۆ ئامادەکردنیان بۆ ژیان زانیوە، هەمیشە ڕێگەی بە یاریکردنی منداڵان داوەو خۆی منداڵ کردۆتەوە لەگەڵیان و بەشێوازە شیرینەکەی بۆ ئاڕاستەکردنیان چووەتە ناو دنیای ساف و پاکی ئەوانەوە.

ئەگەر لە پەیوەندییەکانی سەروەرمانﷺ لەگەڵ منداڵاندا بڕوانین، تێدەگەین کە چۆن لەدڵەوە وابەستەیان بووە و ئامادەکاری بۆ ژیانی داهاتوویان سازاندووە، لە ژیانی پێغەمبەردا لەبارەی ئەمەشەوە نموونەی زۆر سەرسوڕهێنەرو گرنگ بەدی دەکرێت، بۆ چاوخشاندنەوە بەو پەروەردەکردنەی ئەمڕۆ ئێمە پەیڕەوی دەکەین چەند دانەیەك لەو نموونانە دەخەینە بەرچاو، یەعلی کوڕی موڕڕە دەگێڕێتەوە:

" کاتێك لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ لە ڕێگەدا بووین بۆ جێیەك کە بانگهێشت کرابووین، حوسەینی کچەزای پێغەمبەرمانﷺ بینی، منداڵەکە کە پێغەمبەری خوای بینی، بۆ نازکردن بەڕاست و چەپی خۆیدا دەستی بەڕاکردن کرد، پێغەمبەری خواش بۆ دڵخۆشکردنی ئەو، بەدوایدا هەڵهات تاکو گرتی ئینجا لەئامێزی گرت و ماچی کرد."

کەسانێك هەن کە مانایەك نادەن بەم ڕەفتارەی ئەو پێغەمبەرەﷺ کە پێشەنگ و پێشەوایە بۆ مرۆڤایەتی، بەڵام ئەو زۆر باش دەیزانی کە گەورەکان ناتوانن لە ڕێگەی بەکارهێنانی فشارەوە کاریگەرییان لەسەر بچووکەکان هەبێت، بەڵکو بە خۆمنداڵکردنەوە لەناویاندا دەتوانن دڵی ئەوان بەدەست بهێنن. بە خۆبچووککردنەوە لە دنیای منداڵی ئەوداو پێکەوە هەناسەدان لەناو ئەو هەوا شیرینەدا و یاریکردن وەکو هاوڕێ لەگەڵیدا، متمانەیەکی وا بەو منداڵە دەبەخشێت کە ئیتر هەر شتێکی لەگەورەکەیەوە پێ بوترێت بە گوێڕایەڵی جێبەجێی دەکات، چونکە خۆشترین قسە لای هەر کەسێك، ئەو قسەیەیە کە لەکەسێکی خۆشەویستی دەبیستێت.

**نموونەی دووەمیش:** پەیوەستە بە عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەرەوە:

"سوپا لە جەنگ دەگەڕایەوە، منیش لەگەڵ کۆمەڵێك منداڵدا ڕۆیشتین بە پیری پێغەمبەرەوەﷺ، کە بینی ئێمە بەرەو لایان دەچین زۆری پێخۆش بوو، منی باوەش گرت و سوار وشترەکەی کردم، حەسەن و حوسەینیش کە دوایی هاتن لەپشتەوە سواری کردن، بەم شێوەیە تا مەدینە ڕۆیشتین"، ئەم خۆشەویستی و گرنگیەی پێغەمبەری خواﷺ بۆ منداڵان بێگومان لەبەر خۆشەویستی ڕاستەقینەی بوو بۆیان.

ئەو پەیامەش کە لەم ڕەفتارانەی پێغەمبەرەوە پێمان دەگات، بەم جۆرەیە: "منداڵەکان لەخۆشەویستیدا کەم و کورت و بێ ناز مەکەن، ئەوان بەسۆزەوە گەورەبکەن، ئەو مرۆڤانەی دەبنە مایەی خێرو کەڵك بۆ کۆمەڵگە ئەوانەن کە بەخۆشەویستییەوە گەورە بوون، ئەو منداڵەی کە خۆشەویستی نەچەشتبێت، خۆشەویستی بە دەوروبەریشی نابەخشێت"، گرنگی و بایەخدان بە منداڵان کاریگەرترین شێوازە بۆ بەهرەمەندبوونی دەوروبەرو کۆمەڵگەش.

که له گرنگی پێدانەکانی پێغەمبەری نازدارمانﷺ بۆ منـدالآن و یـاری و کێبڕکێ کردن لەگـەڵیان و کـەیف و خۆشـی بیـنین لـه تەماشـاکردنیان و بەدەمەوە چوونیان وردەبینەوە، زیاتر سەرسـام دەبـین بـه گـەورەیی ئـەو زاتەو هەست بەکەم و کورتییەکانی خۆمان دەکەین.

بەسـەرهاتێکی پێغەمبـەری خـواﷺ هەیـه لەگـەڵ نەوەکانیـدا، کـه بەتەواوی لێوان لێوە له پەروەردەیەکی ناوازەی سەرسوڕهێنەر.

پێشەوا عومەرﷺ پێغەمبەری خـوا دەبینێـت کـه هـەردوو کچـەزاکەی سوار شانی بـوون، ئـەویش بەرامبـەر ئـەو نواندنـەی پێغەمبـەردا بـه نـەوە خۆشەویستەکانی دەڵێت: " ئەوەی سوار پشتی بوون، چەندە جوانە."

پێغەمبـەری خـواش ئـەم وەڵامـه شـیرینه دەداتـەوە: " سـوارییەکانی سەرپشتی ئەویش زۆر جوانن."

ئەمڕۆ بیر له باوکێك بکەنەوە که منداڵەکانی خستۆته سـەر شـانی لـه دەرەوە، دەبێـت چـەند کـەس ئـەوە بەئاسـایی ببیـنن؟! پێویسـته پـەروەردەکارانی ئـەمڕۆمان لـه بەرامبـەر ئـەو تـابلۆ جوانـەدا قسـەیەکیان هەبێت. ئێمـه وەك کۆمەڵگـه هێشـتا نەگەیشـتووین بـەو پێگەیـه، ئەمـەش تایبەتمەندی و ناوازەیی مامۆستایەتی پێغەمبەری نازدارمانەﷺ.

## نموونەیەکی پەندئامێز

## ئەسرین ڕشتنی پێغەمبەرﷺ بۆ منداڵان

باسـی میهـرو سـۆزی لـەبن نـەهاتووی سـەرەوەرمان و، بـەزەیی و خۆشەویستی و ئەوینی له ڕادەبەدەری ئەو زاته کـه هـەموو دڵەکان ئـاوالا دەکات، له ئوسامەی کوڕی زەیدەوەﷺ دەبیستین:

کچێکی پێغەمبەرﷺ کە ناوی زەینەب بوو، ناردی بەشوێن باوکیدا کەوا کوڕەکەم گیان دەدا، تەشریفت بێنە بۆلامان، پێغەمبەریشﷺ بە رابەرەکەدا سڵاوی بۆ نارد و فەرمووی: پێی بڵێ: ئەوەی خوا دەیدات بە بەندەی خۆی هەتا ماوەیەك و لەپاشان دەیباتەوە بۆ خەزێنەی خۆی هی خۆیەتی، وە هەموو شتێکیش لەلای خودا ماوەیەکی دیاریکراوی هەیەو کە ئاکامی هات ئیتر پاش و پێشی نییە و ماوەی بەسەر دەچێت! کەوابوو پێی بڵێ: با سەبرو ئارام بگرێت، ساغ لەبەر ڕەزای خوای گەورە، بەڵام دیسانەوە کچەکەی ناردیەوە بەشوێنیدا و سوێندی لێ خوارد کە دەبێ هەر تەشریفی بهێنێ بۆلای، پێغەمبەریشﷺ هەستا لەگەڵ سەعدی کوڕی عوبادەو موعازی کوڕی جەبەل و عوبەی کوڕی کەعب و زەیدی کوری سابت و چەند پیاوێکی تردا چوون بۆلای، کە منداڵەکەیان هێنا بۆ پێغەمبەرﷺ گیانی دەداو هەناسەی سواربوو وەك کوندەیێ کە بێژنگی بەدەم گیانەڵاوە دەهات و دەچوو، جا هۆن هۆن فرمێسك بە چاوەکانی پێغەمبەرداﷺ هاتەخوارەوە، سەعدیشؓ فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا! ئەم گریانە چییە؟ فەرمووی: ئەمە سۆزو ڕەحمە خودا دەیخاتە ناودڵی بەندەکانی خۆیەوە، وە خودای گەورە لەناو بەندەکانی خۆیدا تەنها ڕەحم بەوانە دەکات کە بەڕەحم و میهرەبانن.[١]

---

١- صحيح البخاري، رقم الحديث: ١٢٣٧ .

# پێغەمبەرمانﷺ هەرگیز بەناهەق تووڕە نەدەبوو، هەڵەکانی خەڵکی بە زمانێکی شیاو ڕاست دەکردەوە

**ئاوەڕێکی پەروەردەیی**

" دە ساڵ خزمەتی پێغەمبەری خوام کرد، تەنانەت ڕۆژێك (ئۆفێك)ی نەوت."

**هاوەڵی بەڕێز ئەنەس ﷺ**

پێغەمبەری ئازیزمانﷺ کە بەر لە چەند سەدە تووڕەبوون و فشارخستنە سەرو بەکارهێنانی زەبروزەنگی بۆ پەروەردەی منداڵان بە گونجاو نەزانیوە، بەڵکو ئەو ڕێگەو شێوازە نەرم و نیان و پڕ سۆزەی ئەو تاکو ئەمڕۆش چارەسەری گونجاوی کێشە پەروەردەییەکانە. بە بیرکردنەوە لەو چەسپاندنە سەرنجڕاکێشەی منداڵی مەعنەوی پێغەمبەری خوا ﷺ (ئەنەس) کە وتویەتی: "لە پێغەمبەری خوا بەبەزەییترم نەدیوە بەرامبەر خێزان و منداڵەکانی"، ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە ئەم پەروەردەیەی پێغەمبەری خواﷺ چەندە پەیامی گرنگ و پڕ مانای تێدایە بۆ ئەو خێزانانەی ڕۆژانە کێشەو بەگژداچوونەوە لە ماڵەکانیان دوورناکەوێتەوە. لەبەرامبەر ئەو پەروەردەکردنە هۆشمەندانەو کاریگەرەی چەند سەدە لەمەوبەر کە تاکو ئەمڕۆش لای ئێمە پەیرەو ناکرێت، ڕستەیەك هەیە بۆ وتن:

چیتر پەروەرشیارانی سەردەمی ئەمڕۆمان لە پەروەردەی خێزانی و منداڵدا ناچارن کە زیاتر لە فەرمایشت و ڕەفتارەکانی (مامۆستای هەمووان پێغەمبەرمان موحەممەدﷺ) وردببنەوە، ئەگەر نا پەرتەوازەبوونی خێزان و پێکەوە هەڵنەکردنیان لەبن ناهێنرێت.

با هەوڵ بدەین هەندێك لە نموونە کاریگەرو هەمیشە زیندووەکانی پێغەمبەری خوا لە پەروەردەی منداڵدا بۆ ئەو کەسانە بهێنینەوە کە پێیان وایە منداڵ بەلێدان و تووڕەبوون و هاوارکردن و ڕاونان پەروەردە دەکرێت. پێغەمبەرمان ﷺ بە بینینی هەڵەیەك لەهەر کەسێکدا هەرگیز بەدانەوە لەڕووی ئەو کەسە شەرمەزاری نەدەکرد، بەزمانێکی شیرین هەڵەی هەر ڕەفتارێکی تێدەگەیاند. هەر کاتێکیش سکاڵای هەڵەو خراپیەکان بهێنایەتە لای نەیدەوت: "بۆچی ئەو کەسە ئەو ئیشە خراپەی کردووە؟"، بەڵکو گشتگیرکردنی بەکاردەهێناو هەوڵی دەدا دڵی ئەو کەسە نەشکێنێت و دەیفەرموو: "بۆچی مرۆڤەکان بەو شێوەیە کاری هەڵە دەکەن؟". تەنها مەبەستی بوو هەڵەکە ڕاست بکاتەوە نەك خاوەنەکەی بشکێنێت.

ئەو ئامۆژگاریانەی بە شیرینی دەکرێن، ئەو وتانەی بەجوانی دەوترێن و ئەو قسانەی بە نەرمی و بێ شکاندن دەردکێنرێن کاریگەری ئیجابی و گرنگ لە دنیای مرۆڤەکاندا بەجێدەهێڵن، چ جای ئەگەر منداڵ بێت. پێغەمبەریشمان ﷺ هەمیشە ئەو ڕێیەی گرتووەتەبەر چونکە ئەو بۆ بەهێزکردنی ڕەوشتە جوانەکان نێردراوە، لەبەرئەوە هەرگیز بە وشەی ناخۆش و نەشیاو دڵی کەسێکی -دۆست یان دوژمن- نەڕەنجاندووە.

یادگارییەکی ئەبو ڕەفیعیش نموونەیەکی جوانە بۆ باسەکەمان:

کاتێك ئەبو ڕەفیع بەردی دەگرتە دارخورمای کەسێك لە مەدینە، پێغەمبەری خواﷺ داوای لێکرد کە بەرد نەگرێتە دارخورماکان و ئەو

دەنکانەش کە کەوتوون بیان خوات، دواتریش دوعایەکی کرد: " خوایە سکی ئەم منداڵە تێر بکە."

ئەبو ڕەفیع بەهۆی ئەو ڕاستکردنەوە جوانەی پێغەمبەرەوە چیتر ئەو هەڵەیەی نەکردەوە و، لەدوای دوعاکەی ئەویشەوە چیتر هەستی بەبرسێتی نەکردەوە.

پێویستە دایکان و باوکەکان کاتێك منداڵەکانیان هەڵەیەك دەکەن بەزمانێکی شیرین ئاگاداریان بکەنەوە، هەروەها هۆکار و چۆنێتی هەڵەکەیان بۆ ڕوون بکەنەوە و پێیان نیشان بدەن کە کارە ڕاست و دروستەکە چی یە!

هەرگیز نابێت منداڵەکان بشکێنرێن و سزا بدرێن، منداڵان بەهۆی نەزانینیانەوە کە هەڵسوکەوتێکی هەڵە ئەنجام دەدەن زۆرینەی کات بەرەقی ڕووبەڕوویان دەبنەوە، بەڵام بەڕوونکردنەوەی لایەنی هەڵەی هەڵسوکەوتەکەی بەشێوەیەکی شیرین، دەتوانیت منداڵەکە تێبگەیەنیت و وابکەیت کە ئەو منداڵە جارێکی تر ئەو هەڵەیە دووبارە نەکاتەوە.

منداڵێك کە لەپێش باوکیەوە دەڕۆیشت، پێغەمبەری خواﷺ بانگی کردو لێی پرسی: " ئەوە باوکی تۆ نییە؟"

منداڵەکەش وتی:" بەڵێ، ئەی پێغەمبەری خوا."

پێغەمبەری خواشﷺ فەرمووی:

" کەواتە لەپێش ئەوەوە مەڕۆ، کارێك مەکە کە ئەو پێی خۆش نییەو پێی تووڕە دەبێت، لەپێش ئەوەوە دامەنیشەو ئەو بەناوی خۆی بانگ مەکە"، بەم شێوازە شیرینە و بە ڕوویەکی کراوەو پێکەنینەوە ئامۆژگاری منداڵەکەی کرد، ئەویش وتی: "باشە ئەی پێغەمبەری خوا."

ئێستا ئەگەر بەتووڕەبوون و بەڕەقی ئەم ئاگادارکردنەوەیەی بدایە، بێگومان منداڵەکە لە ترسا ڕەزامەندی دەنواند، بەلام دواتر لەسەر ڕەفتارەکەی بەردەوام دەبوو.

پێغەمبەرمانﷺ هەندێك جار تەنها بەڕوانینێك منداڵانی لە شتێك ئاگاداردەکردەوە، پێغەمبەری خواﷺ زۆر باش تەکنیکی "(ئاگادارکردنەوە بە ڕوانین) لە پەروەردەکردندا پەیڕەو کردووە، جارێك لەماڵەکەیدا خورما کۆکرابووەوە بۆ صەدەقە، حەسەن و حوسەین لەو خورمایانەیان هەڵگرتبوو، پێغەمبەری خواﷺ کە ئەمەی بینیبوو، بۆ ئاگادارکردنەوەیان بەڕوانینێکی پڕ سەرنجەوە تەماشای کردبوون، منداڵەکان لەو تەماشاکردنە بەمانایەی پێغەمبەرﷺ تێگەیشتبوون و یەکسەر خورماکانیان لەدەمیان دەرهێنا بوو فڕێیان دابوو.

پاشان پێغەمبەری خوا ﷺ بەمنداڵەکانی فەرموو بوو:

" دەزانن کە خێزانی موحەممەد لە صەدەقە ناخۆن؟!" لەم دەربڕینە جوانەی پێغەمبەرداﷺ، لەبەر هەڵەی منداڵەکان بەتەنها ئەوانی نەکردبووە ئامانج، بەڵکو شێوازێکی بەکارهێنابوو بۆ ڕاست کردنەوەی ئەوان هەروەها ئاگادارکردنەوەی هەموو ئەندامانی خێزانەکەی لە ڕەفتارێکی هەڵەی لەو جۆرە، ئەو کاتە منداڵەکانیش بیر لەم ئاگادارکردنەوەیە دەکەنەوە و دەڵێن: "کەواتە ئەم قەدەغەکردنە تەنها بۆ ئێمە نییە بەڵکو بۆ هەموو ئەندامەکانی خێزانەکەیە، کەواتە ئێمەش نایخۆین"...

پێغەمبەرمانﷺ بەهێندەی نەرم و نیانی و میهرەبانی و گرنگی پێدانەکانی بە منداڵان، ئارامگریش بوو، چونکە ڕۆڵی گرنگی ئارامگریی لە پەروەردەی منداڵدا دەزانی، دەرکی بەو کاریگەریە نەشیاوانە دەکرد کە لە کاردانەوە نائارام و ڕەقەکانی گەورەکانەوە لەسەر منداڵان دەردەکەوێت، ئەو زانیاریانەی لە خاتوو عائیشەوە پێمان گەیشتووە نموونەی جوانی

ئارامگری و لێبووردەیی پێغەمبەری ئازیزمانﷺ، "منداڵیان دەهێنایە لای پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ ناولێنان و دوعا بۆ کردنی، یەکێك لە منداڵەکان پێغەمبەری خوای تەڕ کردبوو، پێغەمبەری خواش بە بێ توورەبوون، ئاوی هێنا بوو شوێنەکەی پاککردبووەوە"[1]، پێغەمبەری خواﷺ ئەم حاڵەتانەی منداڵانی بەئاسایی وەردەگرت و تێگەیشتووانە چارەسەری دەکرد، هیچ کات بەڕێگەی توورەبوون و هاوارکردن و توندوتیژیدا نەدەڕۆیشت.

گێڕانەوەکانی ئەبو هورەیرەش نموونەی ناوازەو ئاگادارکەرەوەی ئارامگری پێغەمبەرنﷺ بۆمان:

"عەرەبێکی دەشتەکی هەڵسا لەناو مزگەوتەکەی پێغەمبەرداﷺ میزی کرد، چەند کەسێ تێیان خوڕی: ئەها کوڕە! شتی وا نەکەی. پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: تازە وازی لێبهێنن، بەڵام سەتڵێ ئاو بکەن بە شوێنی میزەکەیدا، خوای گەورە بۆیە منی کردووە بە پێغەمبەری ئێوە کە وەك خۆم کار ئاسان بکەن، نەوەك کارگران بکەن (جا کەوابوو دەبێ چاو لە نەزان بپۆشن و بە ئاسکی فێری یاساکانی ئیسلامی بکەن.)[2]

بە مرۆڤی نەفام دەوترێت: (منداڵ) لەم تێگەیشتنەی پێغەمبەری خواشدا لە ڕەفتارەکانی لەگەڵ ئەو کەسانەدا وەکو منداڵ، نموونەی پڕواتامان هەیە، ڕاستکردنەوەی هەڵەکان و وانەپێدانی گرنگ بە منداڵان لەلایەن پێغەمبەری خواوە، هەندێك جار شێوازی (گاڵتەکردن و قسەی خۆش) بەکاردەهێنرا، ئەمەش خولیای منداڵان بوو، ئەوەی کە ئەنەس بۆمان دەگێڕێتەوە، بابەتەکەی پێ دەڕازێنێتەوە:

---

١- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٦٠٠٣

٢- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٥٦٨٥.

پێغەمبەرﷺ خۆی لە ئێمە جیانەدەکردەوە، تەواو تێکەڵاوی دەکردین، ئەوەندە بێ دەمارو بێفیز و بێ دەعیە بوو، گاڵتەو سوعبەتی لەگەڵمان دەکرد، تەنانەت برایەکی بچکۆلەم هەبوو، نازناوی ئەبو عومەیر بوو، بۆ خۆشیی پێمان دەوت باوکی عومەیر، دایك برام بوو، بە منداڵی لە سەردەمی پێغەمبەردا مرد، ئەبو عومەیر کێشکەیێکی هەبوو، گەمەی پێ دەکرد، ڕۆژێك کێشکەکە مرد، پێغەمبەرﷺ هات بۆ ماڵمان تەماشای کرد ئەبو عومەیر خەمبارە، فەرمووی: ئەوە چیتە؟ عەرزیان کرد: مەلیچکەکەی مردووە! فەرمووی: ئەی باوکی عومەیر! مەلیچکەکەت چی بەسەر هات.[1]

مەحموودی کوڕی ڕەبیعەش دەڵێت: "لەبیرمە جارێك پێغەمبەری خواﷺ قومێ ئاوی لە دۆڵچەیێ کردە دەمی و پرژاندی لە دەم و چاوم، ئەو دەمە پێنج ساڵان بووم."[2]

بەم جۆرە نەرمی نواندن و یاری و گاڵتەکردنی پێغەمبەری خوامان لەگەڵ منداڵاندا بۆ دەگێڕنەوە، هەموو ئەم ڕەفتارە جوانانە ئەمەمان پێدەڵێن: بۆ ئەوەی منداڵەکان واز لە لاساریی و خووە خراپەکانیان بهێنن، نابێت بە هاوارکردن و توورەبوون ڕووبەڕوویان ببینەوە، بەڵکو بۆ قایل کردنیان خۆشەویستی و گرنگی نیشان دان پێویستە چونکە منداڵ بایەخ بە وتەی ئەو کەسە دەدات کە خۆشی دەوێت و گرنگی پێدەدات.

---

١- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٥٧٨٣

٢- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٧٧

# نموونەیەکی پەندئامێز

## ئەنەسی بچکۆلە و پێغەمبەرﷺ

ئەنەسؓ کە دە ساڵ خزمەتی پێغەمبەری خوای کردو شەرەفی منداڵی مەعنەوی ئەوی پێدرا، نموونەمان لە ژیانی خۆی بۆ دەهێنێتەوە لەبارەی لێك نزیك بوونەوەکانی پێغەمبەر لەگەڵ منداڵاندا:

رۆژێك پێغەمبەری خواﷺ بۆ کارێك منی ناردە جێیەك منیش بۆ بەجێهێنانی فەرمانەکەی، کەوتمەڕێ کە دەڕۆیشتم لە ڕێگەدا گەیشتم بەو منداڵانەی لە کۆڵان یارییان دەکرد، ماوەیەك تێپەڕی لە پشتەوە هەستم بەدەست لێدانی پێغەمبەری خواﷺ کرد لەشانەکانم کە بینیم زەردەخەنەی دەکرد:

" ئەی ئەنەسی بچکۆلە، چوویتە ئەو شوێنەی پێم وتیت؟"

منیش وتم:

" ئەی پێغەمبەری خوا هەر ئێستا دەچم."

سوێند بەخوا دە ساڵ خزمەتی پێغەمبەرم کرد، بیرم نایەت کە لەنەکردنی کارێکدا پێی وتبم: "بۆچی ئەو کارەت نەکرد؟" و لەکردنی کارێکیشدا وتبێتی: "بۆچی ئەو کارەت کرد؟!"

تەنانەت رۆژێك (ئۆفێك)ی نەوت.

ئەنەس لە یادەوەریەکی تریشدا ئەمەمان بۆ دەگێڕێتەوە:

" ماوەی دە ساڵ لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا بووم، جارێك لەبەر جێ بەجێ نەکردنی فەرمانێکی یاخود ئەنجام نەدانی کارێك، سەرزەنشتی نەکردووم، ئەگەر یەکێکیش لە خێزانەکەی ڕەخنەی لەکارێکم بگرتایە، ئەو

دەیفەرموو: " واز لەو بهێنن! ئەگەر لەقەدەردا هەبووایە ئەو کارە دەکرا..."

بەر لەفەرمان کردن بە منداڵان و کار پێ سپاردنیان ، پێویستە دایك و باوکەکان سەرەتا لێپرسینەوەی خۆیان بکەن و لە چۆنێتی ڕەفتارکردنیان لەگەڵ منداڵاندا تێبگەن، نابێت لەبیرمان بچێت نهێنی پەروەردەی منداڵ، زمانی شیرین و خۆشەویستی و گرنگی پێدانە، نەك ترساندن و توورەیی.

# پێغەمبەرمانﷺ لە پەروەردەی منداڵدا گرنگی بە یاریچە دەدا

## ناوەڕۆکی پەروەردەیی

خاتوو عائیشە دەگێڕێتەوە: "من لەلای پێغەمبەری خوا یارییم بە بوکەڵە دەکرد، چەند هاوڕێیەکم هەبوون دەهاتن بۆلام، کاتێ پێغەمبەریانﷺ دەبینی خۆیان دەشاردەوە لەشەرمدا، پێغەمبەریش یەکەکە دەیناردنەوە بۆلام".[١]

هیچ گومانی تێدا نییە ئەو پارچەیەی لەجیهانی منداڵ دانابڕێت، یاری و یاریچەکانیەتی، منداڵەکان بەیاری و یاریچەکانیان داواکاری و خواست و خۆشەویستی و ڕقەکانی دنیای ڕۆحییان دەردەبڕن. لەم ڕووەوە، یاری و یاریچەکان ئەوەندەی ئامرازی کات بەسەربردن و خۆشین، بەڕادەیەکی زۆریش کارێکە کە دەبێت بەجددی بگیرێت و ئامرازێکی پەروەردەییە.

لەبەرئەوەی یاری و یاریچەکان کاریگەرییان لەسەر پێگەیشتنی فیزیکی و ڕۆحی و زیهنی منداڵ هەیە، پێویستە لێیان بێ بەش نەکرێت، پێغەمبەری خواﷺ کە بەم وردەکاریی و پێویستییە لەپەروەردەکردندا

---

١- صحيح مسلم، رقم الحديث: ٤٥٧٤

ئاگاداربووه، ئـازادی بـه منـداڵان داوه لـه یاریکردنیانـدا و چـێژی پـێ بەخشـیون تەنانـەت خۆیشـی یـاری لەگـەڵ کـردوون، پێغەمبـەری خـوا ﷺ گرنگی بەیاریچەکانی ئەو سەردەمەی منـداڵان دەدا، کـە زیـاتر ئەسپی لـە تـوڵ دروسـتکراوو خانۆچـکەی قورپینـەو ئامرازەکـانی کێبڕکێکـردن بـوون، تەنانەت ئەو پێشبڕکێی بە منداڵان دەکردو براوەکانی خەڵات دەکرد.

خـاتوو عائیشـە کـە بچـووکترین هاوسـەری پێغەمبـەری خـوا بـوو لـە تەمەنـدا، یاریچـەو بوکەڵـەی هـەبوون کـە خۆشیدەویسـتن و یـاری لەگـەڵ دەکـردن، پێغەمبـەری خـواش گرنگـی پێـدەدان و ئـازادی پـێ دەدا لـە یاریکردندا.

یاری و یاریچەکان لە دنیای منداڵدا گرنگـی زۆریـان هەیـە، کـە منـداڵ ئاسوودە دەکەن، فشارو بێزاریەکانیان کەم دەکەنەوە و کاتی خۆشـی پـێ دەبەنە سەر، جگە لەمانەش برەو بە دەربڕینی توانا ئەقڵی و فیکریەکانیان دەدەن و دەبنـە هۆکـاری هێنانـەدی خەیاڵـەکانیان، لەوانـەش گـرنگتر پێگەیشـتنی تەندروسـتی و زیهنـی منداڵـەکان دەپـارێزن. لەبەرامبـەر ئـەو هـەموو گرنگییـەی یاریچـەکاندا، لەمڕۆمانـدا بـەهۆی زۆری و تێکـەڵ و پێکەڵیانەوە هەڵبژاردنیشیان گرنگە، چونکە هـەموو یاریچـەیەك کاریگـەری ئیجابی لەسەر پەروەردەی منداڵ دانانێت، لەبەرئـەوە پێویسـتە بـە باشـی هەڵیانبژێرین، پەروەرشیاران بەگشتی یاریچەکان بەسـەر چـوار ناونیشـاندا دابەش دەکەن:

١- ئەو یاریچانەی کۆمەڵایەتی بوونی منداڵان دەپارێزن:

ئەم جۆرە یاریچانە یارمەتیدەر دەبن لە پەیوەندی بەستنی منداڵەکان لەگەڵ دەوروبەریانداو هەروەها بەشداریکردنیان لە گرووپ و کۆمەڵەکاندا.

٢- یاریچە هەستیارەکان: ئەم یاریچانە هـەم بـەر لـەترس و دڵـەڕاوکێکانی منداڵان دەگرێت و، هەم ڕۆڵی هەیە لەوەی منداڵەکان لەگەڵ ئـەو بابەتـەی

حەزی لێ دەکەن و پێیان خۆشە، بژین و پێی بگەن، لەبەرئەوە ئەم یاریچانە مانای باوەڕ و متمانەو خۆشەویستی و دۆستایەتی دەگەیەنن لەلای منداڵ.

٣- ئەو یاریچانەی یارمەتی پەروەردەی دروستی منداڵ دەدەن ئەمانەش کتێبی ڕەنگاو ڕەنگ و هێڵکاری و، ئەو یاریچانەی تریش دەگرێتەوە کە گرنگی بە بەرەوپێشچوونی زیرەکی و توانای ئەقڵی و پەروەردەیی دروستی منداڵەکان دەدەن.

٤- ئەو یاریچانەی کاتی خۆشیان پێ بەسەردەبرێت، ئەمەش ئەو یاریچانەیە کە بەشێوازی ڕەنگاو ڕەنگ و سەرنج ڕاکێش دروستکراون و منداڵان بۆ ماوەیەك کاتی خۆشی لەگەڵ بەسەر دەبەن.

یەکێکی تر لە گرنگیدانەکان بەم بابەتە ئەوەیە کە کام جۆر یاریچە بەکام تەمەن بدرێت؟!

**پێشنیاری پسپۆرانی ئەم بوارەدا بەم جۆرەیە:**

* بۆ منداڵانی تەمەن ٦ بۆ ٧ مانگان:

لەبەرئەوەی منداڵانی ئەم تەمەنە تازە فێری دانیشتن دەبن و زۆر توانای تێگەیشتنی چواردەوریان نییە، پێویستە کەرەستەی بچووك و پلاستیکیان پێ بدرێت کە بەقەبارەی دەستیان بخوات.

* بۆ منداڵانی تەمەن ٨ بۆ ١٢ مانگ:

منداڵانی ئەم تەمەنە دەستیان بە خۆڕاگیرکردن و ڕۆیشتن کردووە، گرنگە کە دایك و باوك چیرۆکی وێنەداریان بۆ بخوێننەوە.

* بۆ منالانی تەمەن ١٥ بۆ ١٨ مانگان:

منداڵی ئەم تەمەنە جوڵەی زۆر دەکەن، لەبەرئەوە پێویستە یاریچەی جوڵاوو گونجاو بۆ دەستکاری کردنی منداڵان، هەروەها یاریچەی دەنگدار هەڵبژێردرێت.

* بۆ منداڵانی گەورەتر لە ١٨ مانگانیش:

لەم تەمەنەدا منداڵ لەبەردەمی دۆزینەوە تازەکاندایە، بۆیە حەز بە بلۆك و پارچە قوتوو و کەلوپەلی شێوە جیاواز دەکەن تاکو شتی نوێی لێ دروست بکەن.

* بۆ منداڵانی تەمەن ٢ بۆ ٣ساڵان:

لەم تەمەنەدا منداڵان دەست بەڕۆڵ بینین دەکەن لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا، بەگشتیش دەبن بە دایك یان باوك، لەبەرئەوە پێویستە یاریچەیەك بۆ منداڵانی ئەم تەمەنە بکڕدرێت کە بتوانرێت ژیانیان بۆ دراماتیزە بکات، وەك بوکەڵە، کەلوپەلی بچووکی ناو ماڵ، کەرەستەی بیناکردن، سێتی جۆراوجۆری ئاژەڵان و یاریچەی هاوشێوە.

* بۆ منداڵانی تەمەن ٣ بۆ ٤ ساڵان:

لەم تەمەنەدا زۆر حەز بە جووڵەی زۆر و هەڵبەزینەوە دەکەن، بۆ ئەم تەمەنەش پاسکیلی سێ ویلی، کەلوپەلی جۆلانە پێکردن، ئۆتۆمبیلی بارهەڵگرو بلۆکی پلاستیکی بینایان بۆ هەڵبژێردێت.

* بۆ منداڵانی ٤ بۆ ٦ ساڵان:

منداڵان لەم تەمەنەدا پێیان خۆشە کە قەڵەم و کاغەز و دروستکردنی شێوەی تازە لە پارچەی جیاواز و وێنەکردن بە بۆیە، فێر ببن، لەبەرئەوە پێویستە بۆیەی پاستیل و بۆیەی ئاویی و کارتۆن و ئەو کەرەستانەی بۆ ئەو خواستانەیان دەگونجێت هەڵبژێردرێت.

* بۆ منداڵانی سەروو تەمەن ٦ ساڵانیش:

منداڵی ئەم تەمەنە ئیتر دەستی بە چوونە قوتابخانە کردووە، بۆیە گرنگی بە دوو گۆڵی و باسکە و دووچەرخە و یاری لەم جۆرە دەدەن، بەتایبەتیش کتێبی وێنەدار سەرنجیان ڕادەکێشێت.

ئەو ڕێگەیەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەپەروەردەکردندا پەیڕەوی کردووە کە بەکاریگەرو گرنگ بینینی یاری و یاریچەکانە بۆ منداڵ ، ئەمڕۆش لەهەموو ڕوویەکیەوە شێوازێکی بەبایەخ و پێویست و جێگەی گرنگی پێدانە لەپەروەردەکردندا.

## نموونەیەکی پەندئامێز

### لەگەڵ دایك و باوکتان بچنە بەهەشت

منداڵی ئیمانداران بەهەشتین... باوکیان –حەزرەتی ئیبراهیم (سەلامی خوای لێ بێت)– پارێزگارییان دەکات، لەڕۆژی قیامەتدا بە منداڵی موسوڵمانان دەوترێت: "بڕۆنە بەهەشتەوە" ئەوانیش بە ڕاکێشانی پۆشاکی دایك و باوکیان دەڵێن: "دایك و باوکمان دەوێت"، بۆ ئەمەش پێیان دەوترێت:

" ئێوە، لەگەڵ دایك و باوکتان بڕۆنە بەهەشتەوە."

پاشان منداڵانی لەبارچوو دێن بەوانیش دەوترێت:

" بچنە بەهەشتەوە"، ئەوانیش دەڵێن:

" دایك و باوکمان دەوێت."

لەکۆتاییدا ئەوانیش لەگەڵ منداڵەکانیان دەچنە بەهەشتەوە.

# پێغەمبەرمانﷺ هەستیاربوو بەرامبەر بە مافەکانی منداڵان و بە یەکسانی ڕەفتاری لەتەکدا دەکردن

**ناوەڕۆکی پەروەردەیی**

" لەخوابترسن و لەگەڵ منداڵەکانتاندا دادپەروەر بن." [١]

**پێغەمبەرمان موحەممەد ﷺ**

هەستیاری نیشاندان بەرامبەر مافەکانی منداڵ، ڕەفتارێکی کاریگەرە بۆ بەدەست هێنانی متمانەو دڵی منداڵ، بەم شێوەیە منداڵ تێدەگات چەندە خۆشویستراوەو چەندە بایەخی پێ دەدرێت. دادپەروەری لەنێوان خوشك و براکانیشدا و یەکسانی نیشان دان بەشێکی گرنگی پەروەردەکردنی منداڵ لەخۆ دەگرێت، ئەگەرنا ئیرەیی بردن و لێك دوورکەوتنەوە لەنێوان منداڵەکاندا دەست پێ دەکات دوویەرەکی دروست دەبێت لەنێوان (کەم خۆشویستراوو زۆر خۆشویستراودا).

منداڵەکان ڕەنگدانەوەی ئەو هەڵسوکەوت و پەروەردەیەن کە لەگەڵیان پەیڕەوکراوە ئەمە بەمانایەکی تر وەکو کار و کاردانەوە وایە،

---

١- صحيح البخاري: رقم الحديث: ٢٤٦٨

لەبەرئەوە مافی منداڵ و هەڵسوکەوتی یەکسانانە لەدنیای منداڵدا دەبێتە خاڵی وەرچەرخان. جا ئەم بابەتە گرنگەی لە دنیای منداڵدا بایەخی زۆری هەیە، پێغەمبەرمان ﷺ زۆر باش لەبەرچاوی گرتووە ئێمەش چەند نموونەیەك وەردەگرین:

**یادەوەری سەهلی کوڕی سەعد:**

خواردنەوەیەك هێنرا بۆ پێغەمبەری خواﷺ و لێی خواردەوە، مێردمنداڵێك لای ڕاستیەوەوە و چەند بەساڵاچوویيەکیش لای چەپییەوە بوون. پێغەمبەرﷺ بە کوڕەکەی فەرموو: مۆڵەتم دەدەیت بیدەم بەوان؟ کوڕەکە وتی: نەبەخوا ئەو بەشەی لە تۆوە پێم دەگات، کەس پێشی خۆم ناخەم، پێغەمبەری خواش دایە دەستی.[1]

پێغەمبەرمانﷺ هەمیشە منداڵانیشی بەهەند وەردەگرت و بە پەراوێزخستن و وتنی: "ئەمان بچووکن" چاوی لێ نەدەخافڵاندن.

منداڵێك هەبوو کە پارێزگاری لە ئەبوجەهل دەکرد، بەڵام ئەو مافی خۆی پێ نەدەدا، منداڵەکەش ڕۆیشت سکاڵای لای پێغەمبەری خوا کرد، پێغەمبەریشﷺ دەستی منداڵەکەی گرت و چووە لای ئەبو جەهل و پێی فەرموو: "مافی ئەم منداڵە بدە"...

ئەبو جەهلیش بێ هیچ ناڕەزایی دەربڕینێك مافی منداڵەکەی دا، هاوەڵەکانی ئەبوجەهل بەمە زۆر سەرسام بوون، لەوە تێنەگەیشتن کە بۆچی ئەبوجەهل پارێزگارییەکی لەخۆی نەکرد، ئەبوجەهلیش حاڵەتەکەی بەو جۆرە ڕوون کردەوە:

---

١- صحيح البخاري: رقم الحديث: ٥٣٠٤

" من بەرەنگاری موحەممەدم پێ نەدەکرا، چونکە لەلای ڕاست و چەپیەوە دوو پیاوی بەهێز هەبوون، ئەگەر بەرامبەر داواکەی بوەستامایەتەوە، منیان دەکوشت، لەبەرئەوە مافی منداڵەکەم دا".

مافی منداڵ ئەمانەتێکی ئەوەندە پیرۆزە کە تەنانەت فریشتەکانیش بۆ پارێزگاری دەچن، بەمانایەك لەشێوەی دوو پیاوی بەهێزدا لەبەر مافی ئەو منداڵە ئەبوجەهلیان ترساندووە.

پێغەمبەری ئازیزمانﷺ نموونەیەکی تاك و ناوازەیە لەیەکسانی نیشان دان و دادپەروەری نێوان منداڵاندا، ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەری خواﷺ لەبارەی ئەم باسەوە هەموو گرنگیەکەیمان بۆ پوخت دەکاتەوە:

" لەخوا بترسن و لەنێوان منداڵەکاندا دادپەروەر بن"، نموونەکانی پێغەمبەرﷺ لەبارەی دادپەروەری نێوان منداڵاندا زۆرن، چەند دانەیەکیان بۆ بەپێوەرکردنی دایك و باوکەکان دەهێنینەوە:

پیاوێك هاتبووە لای پێغەمبەری خواﷺ، منداڵێکیشی لەگەڵ بوو بوو کاتێك پیاوەکە منداڵەکەی ماچ کردبوو، پێغەمبەری خوا پێی فەرموو بوو:

" منداڵەکەت خۆش دەوێت؟"

پیاوەکەش وتبووی : بەڵێ.

بۆ ئەمە پێغەمبەری خواﷺ فەرمووبووی:

بەو میهرەبانییەی بۆ منداڵەکەت هەتە، تۆش ڕەحم و سۆزی خوا بەدەست دەهێنێت، چونکە خوای گەورە میهرەبانترینی میهرەبانەکانە".

ئەنەسیشرضي الله عنه لەم بارەیەوە دەگێڕێتەوە:

پیاوێك هاتە لای پێغەمبەری خواﷺ، منداڵێکی لەگەڵ بوو، ماچی کردو خستیە سەر ئەژنۆکانی، پاشان پیاوەکە کچەکەی هات و لەسەر ئەژنۆی دانەنیشاند، بەڵکو لە پێشی خۆی داینیشاند، پێغەمبەری خواﷺ کە ئەوەی بینی فەرمووی:

" دەبێت بە یەکسانی ڕەفتار بکەیت لەنێوانیاندا".

پێغەمبەری خواﷺ هیچ کات خۆشی لەو کەسانە نەدەهات کە جیاوازییان لەنێوان کچ و کوڕدا دەکرد، بەم شێوەیە ئەو کەسانە ئاگاداردەکاتەوە کە لەم جۆرە ڕەفتارانەیان هەیە، لەچاوی ئەودا منداڵ، کچ و کوڕی نەبوو، هەردووکیان شیاو بە بەزەیی و میهرو خۆشەویستی بوون.

یادەوەریەکەی نوعمانی کوڕی بەشیریش زۆر پەندئامێزە:

" باوکم شتێکی لە ماڵەکەی پێ بەخشی بووم دایکیشم وتی تا پێغەمبەری خوا نەکەنە شاهیدی ئەو بەخشینە من قبوڵی ناکەم، لەبەرئەوە باوکم منی بردە لای پێغەمبەری خواﷺ بۆ بە شاهیدگرتنی ئەو، پێغەمبەری خواﷺ ئاگاداری باسەکە بوو، لە باوکمی پرسی:

" منداڵی دیکەت هەیە؟"

باوکیشم وتی: " بەڵێ، هەمە."

" بۆ منداڵەکانی دیکەشت بەهەمان شێوە بەخشینت ئامادەکردووە؟"

" نەخێر."

فەرمووی: "لەخوا بترسن و لەنێوان منداڵەکانتاندا یەکسان بن."

کە لای پێغەمبەر ڕۆیشتن باوکم وازی لەبەخشینەکەی هێنا بۆم.[١]

---

١- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٢٤٦٨

# نموونەیەكی پەندئامێز

## تابلۆیەكی پڕ پەند لە پەروەردەی منداڵدا

لەبارەی جیاوازی نەكردن لەنێوان منداڵداو دادپەروەری نێوانیان، پێشەوا عەلی ڕووداوێكی نموونەیی لەبارەی پەروەردەی منداڵەوە دەگێڕێتەوە.

پێغەمبەری ئازیزمانﷺ هاتبووە سەردانی ئێمە، ئەو شەوە لای ئێمە مایەوە، حەسەن و حوسەینیش خەوتبوون، لەناكاو حەسەن هەستاو داوای ئاوی كرد، پێغەمبەری خواﷺ بەدەمیەوە هەستاو پەرداخێك ئاوی هێنا كە پێی بدات، لەو كاتەدا حوسەینیش بەناگاهات دەستی بۆ ئاوەكە ڕاكێشاو داوای كرد ئەو كات پێغەمبەرمانﷺ ئاوەكەی نەدا بە حوسەین بەڵكو دای بە حەسەن، فاطمەش بەرگەی ئەوەی نەگرت و لە باوكی پرسی:

" حەسەنت لە حوسەین خۆشتر دەوێت؟! "

پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی:

" نەخێر بەڵام حەسەن پێشتر داوای ئاوی كرد."

# پێغەمبەرمانﷺ بە پێی ئاستەکەی قسەی لەگەڵ منداڵ دەکرد

**ناوەڕۆکی پەروەردەیی**

" با گفتوگۆتان لەگەڵ خەڵکیدا بەپێی ئاستی خۆیان بێت! "[1]

**پێغەمبەرمان موحەممەد ﷺ**

لە هەستیارترین و گرنگترین لایەنەکانی پەروەردەی منداڵ لەلایەن دایك و باوکیەوە، ڕەفتارکردن و قسەکردنە لەگەڵیان بەپێی ئاستی خۆیان، بۆ ئەمەش دەبێت زۆر باش منداڵەکەت بناسیت ئەمەش ئەو خاڵە گرنگەیە کە پێغەمبەر ﷺ پێداگربوو لەسەری و دەیفەرموو:

"با گفتوگۆتان لەگەڵ خەڵکیدا بەپێی ئاستی خۆیان بێت". ئەو خەسڵەتەی گرنگە دایکان و باوکان ڕەچاوی بکەن، ئەوەیە کە بە باشترین شێوە منداڵەکانیان بناسن و لێیان تێبگەن، چونکە ئارەزوومەندانەترین ڕەفتار لای منداڵان گرنگی پێدان و تێگەیشتن و ڕێز لێگرتنیەتی، بۆیە پێویستە دایکان و باوکان هەر لە لەدایك بوونی منداڵەکانیانەوە چاودێری خواست و تایبەتمەندی و داواکاری و هەست و جیاوازیەکانیان بن و، پێویستە ئەوە لەبیر نەکەین کە هەر منداڵێك شێوازی تایبەت و جیاوازی

---

[1]- المطالب العالية للحافظ ابن حجر العسقلاني، رقم الحديث: ٢٨٢٤

هەیە لە دەربڕینی خواست و داواکاریەکانی، لەبەرئەوە پێویستە بەسەرنجەوە لێیان تێبگەین، بەدەر لەوەش ناسین و ئاشنابوون بە گەشەی دەروونی کەسایەتی و پێگەیشتنی ئەو منداڵە زۆر گرنگە.

خاسیەتێکی تریش ئەوەیە کە ئەنجامدان یان ئەنجامنەدانی کارێك کە لەگەڵ تەمەنەکەیدا بگونجێت دەبێت لەبەرچاو بگیرێت، هەندێك جار دایکان و باوکان بەدەر لە ئاگادارییان بەتواناو تەمەنی منداڵەکانیان و گرنگیدان بە گەشەی تواناکانیان ڕەفتار دەکەن. پێویستە ئەوە لەبیر نەکرێت، هەندێك لەمندالآن بەهۆی گەورەبوونیان لە کەشێکی جیاوازی هەست و سۆزو هۆکاری تری کۆمەڵایەتییەوە هەندێك جار لەپێگەیشتندا دوادەکەون، لە ماڵێکی لەم جۆرەدا سەرخستنە سەر منداڵەکەو چاوەڕێکردنی بەرهەمی زیاتر لە تواناکانی ئەو منداڵە بەرەو هەڵدێرو شکستی دەبات.

بێگومان بەتەنها چاودێریکردنی گەشەی فیزیکی و زیهنی منداڵ بەس نییە، بەڵکو پێویستە لە ڕووی ڕەوشت و کارەکتەریشەوە پشتگوێ نەخرێت، لەلایەکی تریشەوە پێویستە جارجارە پیاسەیەك بەناو دنیای خەیاڵی منداڵەکەشدا بکرێت ئەمە دەبێتە هۆی باشتر ناسینی منداڵەکە. هەروەك گرنگە کە دایك و باوك کاتی پێویست بۆ منداڵەکانیان تەرخان بکەن لەگەڵیاندا قسە بکەن و لە هەڵەکان بیان گێڕنەوەو بۆ کارە ڕاستەکانیشیان دەستخۆشییان لێ بکەن، هەروەها کاتە خۆشەکانیان بیر بهێننەوە و پەیوەندیەکانیان بەهێز بکەن و وایان لێ بکەن هەست بکەن بەشێکی گرنگن لە خێزانەکەیان، ئەمانە متمانەیەکی هەمیشە زیندوو لە منداڵدا دروست دەکەن.

پێویستە زۆر باش ئەوە بزانرێت کە منداڵ شێوازێکی جیاوازو تایبەت لە تێگەیشتن بەخۆی هەیە، دایك و باوکیش گرنگە کە ئەو شێوازە

بدۆزنـەوە و لەبەرچـاوی بگـرن، ئەگـەرنا دروسـتکردنی پەیوەنـدی لەگـەڵ منداڵەکـەدا سـەخت دەبێـت ئەمـەش بـەمانای لەیـەك تێنەگەیشـتنی بەرامبەرەکان دێت، کە لە نموونەکانی ژیانی ئازیزمانﷺ وردەبینەوە لێك تێگەیشتن و هەڵسوکەوتکردنی بەپێی ئاستەکانیان لەگەڵ منداڵدا بەدی دەکەین.

## نموونەیەکی پەندئامێز

## قسەکردن بە زمانێکی تێگەیشتووانە

نموونەیەك باس بکەین لەسەر ڕەفتاری سەروەرمان بەپێی ئاست و پێگەی کەسەکان:

جارێك لاوێکی خوێن گەرم لەڕووی پێغەمبەرداﷺ وتی:

" ئەی نێردراوی خوا ڕێگەم بدە زینا بکەم! "

لەبەرامبـەر ئـەو بـێ شـەرمیەی گەنجەکـەدا ، هـاوەڵان تووڕەبـوون ویستبویان ئازاری بدەن: "بێدەنگ... بێدەنگ..."

پێغەمبەری خوا لە وەڵامی ئەو گەنجەدا کە وتەکەی هەموو ڕەوشت و یاسایەکی سەرەو ژێر دەکرد، بانگی کردە لای خۆی و داینیشاند، ئەو قسانەی لەنێوانیشیان کران، دەرس و وانەی پڕ پەندن.

" بڵێ بزانم، ڕازی دەبیت بەوەی کەسێك زینا لەگەڵ دایکت بکات ؟"

" نەخێر... هەرگیز"

" بێگومان هیچ کەس ڕازی نابێت زینا لەگەڵ دایکیدا بکرێت.."

" باشە ، ئەی ڕازی دەبیت زینا لەگەڵ کچت بکرێت؟"

" نەخێر .... بێگومان."

" کەوابێت، هیچ کەس نایەوێت زینا لەگەڵ کچەکەی بکرێت."

" ئەی ڕازی دەبیت زینا لەگەڵ خوشکەکەت بکرێت؟"

" مومکین نییە....نابێت."

" هیچ کەس نایەوێت زینا لەگەڵ خوشکەکەی بکرێت."

" ئەی ڕازیت لەگەڵ پوورت زینا بکرێت؟"

" نەخێر .... ڕازی نابم."

" بێگومان، کەس ڕازی نییە زینا لەگەڵ پووری بکرێت."

پێغەمبەری خوا بە زمانێکی تێگەیشتووانەو شیرینەوە، گەنجەکەی لەمانای زیناکردن گەیاند و قایل بەنەکردنی کرد، گەنجەکەش بەو شێوازە لێبووردەییەی پێغەمبەری خوا کاریگەر بوو، جارێکی تر بیری لەوجۆرە ڕێگەیە نەکردەوە.

لەمەوە تێدەگەین قسەکردن بەپێی ئاست و تێگەیشتنەکان و بەکارهێنانی شێوازی گونجاو لە شوێنی گونجاوی خۆیدا، دەبێتە هۆی کاریگەربوونی بەرامبەرو دووبارە بەدەست هێنانەوەی ئەو کەسە. لەبەرئەوە پێویستە دایکان و باوکان و پەروەردەکاران ئەم شێوازە لە لێك نزیك بوونەوەو هەڵسوکەوت کردن هەڵبژێرن.

## پێغەمبەرمان ﷺ
## شێوازی (قایل کردن)ی بەکاردەهێنا

**ناوەڕۆکی پەروەردەیی**

" بەجوانی منداڵەکانتان پەروەردە بکەن."

دایك و باوك زۆر باش دەزانن کە قایل کردنی منداڵـەکان لـە بابەتێکدا کارێکی زۆر ئاسان نییە، پێویستە بۆ تێگەیاندنی منداڵەکان شێوازی گرنگ لە قایل کـردن بـەکاربهێنرێت، دەتـوانین ئـەو ڕێچـکانەی پێغەمبـەرمان بـۆ ڕازیکردنی منداڵەکان بەکاریهێناون بەم شێوەیە ڕیزبکەین:

- پێویستە بە زمانێکی گونجاو و شیاو تێبگەیەنرێت.
- بەو زمانە قسەی لەگەڵ بکرێت کە تێی دەگات.
- باسەکە بە نموونە و چیرۆك ئاوێزان بکرێت.
- زمانێکی شیاوی جەستەیی بەکاربهێنرێت.
- بەشێوەی وێنەو هێڵکاری دەربڕدرێت.

وەك دەبینرێت ڕێگە زۆرە بۆ قایل کردنی منداڵەکان لەسـەر بابـەتێك، بێگومان ئەوەش بەپێی خاسیەت و تایبەتمەنـدی و تێگەیشـتنی منداڵەکـە دەگۆڕێت، پێغەمبەریشمان لەم بارەیەوە چەندین نموونەی ژیانی هەیە، کە گونجاندنەکانی ئەو سەردەمە، ئێستاش درێژەیان هەیە.

پێغەمبەری خواﷺ سەرنجی قسەکردنی منداڵانی دەدا، تا شێوازی تێگەیشتنیان بەکاربهێنێت، چونکە ئەو باش دەیزانی هەر باسێك دەبێت بە باشی شیبکرێتەوە تاکو باش بگات، تێگەیاندنێکی باشیش بە ڕستەی سادە و ڕوون و جارجارە دووبارەکردنەوە دەبێت، بۆیە پێغەمبەری ئازیزمانﷺ بۆ فێرکردنی زانیاریەکی تازە یاخود گرنگ سێ جار دووبارەی دەکردەوە و خاسیەتی گرنگیەکەی لەزەینەکاندا جێگیر دەکرد.

دایکی ئیمانداران خاتوو عائیشە(ڕەزای خوای لێ بێ) شێوازی قسەکردنی پێغەمبەرمانﷺ بەم جۆرە بۆ دەگێڕێتەوە:

" پێغەمبەری خواﷺ وەکو ئێوە بەخێرایی و یەك لەدوای یەك قسەی نەدەکرد، بەڵکو ڕێك و پێك و لەسەرخۆ دەدوا، کە ئەگەر کەسێك بیویستایە دەیتوانی وشەکانی بژمێرێت". لەم بابەتەدا ئەنەس دەفەرمووێت:

" پەیامبەری خوا کە ڕستەیەکی دەوت تا هەمووانی تێدەگەیاند سێ جار دووبارەی دەکردەوە، کە دەگەیشت بە کۆمەڵێك سەلامی لێ دەکردن، کە قسەکەی دەکرد نە زۆری دەوت نە کەم، لەگفتوگۆدا بە بەکارهێنانی وشەی ناپێویست قسەی درێژ نەدەکردەوە".

یەکێکی تر لە شێوازە گرنگەکانی پێغەمبەری خواﷺ بۆ تێگەیشتنی باشتر لە بابەتێك.. نموونەو چیرۆکی دەهێنایەوە، ئاشکرایە بۆ چەسپاندنی باسێك لە بیرو هۆشدا بەکارهێنانی چیرۆك و نموونەهێنانەوە چەندە کاریگەر دەبێت، بەتایبەتیش شێوازێکی پڕ بایەخە بۆ پەروەردەی منداڵ، لەبەرئەوە پێغەمبەرمانﷺ ئەم تەکنیکەی زۆر بەکاردەهێنا. کاتێکیش باسی نوێژی دەکرد ئەم نموونەیەی دەهێنایەوە:

" پێم بڵێن ئەگەر جۆگەلە ئاوێ لەبەر دەرگای یەکێکتاندا بێت و، هەموو ڕۆژێ پێنج جار خۆی تیا بشۆرێ ئایا هیچ چڵکی پێوە دەمێنێت؟

یاران وتیان: نەخێر هیچ چڵکی پێوە نامێنێ. فەرمووی: ( دە ئەمە ئەم پێنج نوێژە فەرزەیە، خوا گوناهیان پێ دەکوژێنێتەوە.)[1]

هەڵبەت دایکان و باوکان ئەو ڕاستییە دەزانن کە نموونەی لەم جۆرە کاریگەری زۆری هەیە لەسەر تێگەیشتنی منداڵ، چونکە منداڵ حەزی لە ئامۆژگاری کردن نییە، هەروەها وەکو خۆی لەباسەکە تێناگەن، لەبەرئەوە گرنگە بە نموونەی زیندوو و ڕاستەقینە بابەتێکیان بۆ ڕوونبکرێتەوە، ئەوەی کە پێغەمبەریشﷺ ئەنجامی دا ئەمە بوو، هەروەها پێغەمبەرمانﷺ لە ڕوونکردنەوەی باسێکدا بە چیرۆك کردنی پەیڕەو دەکرد، لەبەرئەوەی چیرۆك تێڕوانینێکی بەرفراوان دەبەخشێتە گوێگر، منداڵانیش بەخۆدۆزینەوەیان لەناو چیرۆکەکاندا ڕێگەچارە بۆ خۆیان دیاری دەکەن و توانای تێگەیشتنیان زیاد دەکات، بەکارهێنانی ئەم شێوازەش لە قورئانی پیرۆزدا بەرچاوەو پێغەمبەریشمانﷺ جارجارە بەکاری دەهێنا.

بۆ زانینی چۆنێتی بەچیرۆك کردن لای پێغەمبەری خواﷺ، با گوێ لە ئەبو هورەیرە بگرین:

"سەگێك لە تینوێتیدا لەحاڵی مردندا بوو، لەدەوری بیرێك هەڵدەسوڕا، یەکێکی خراپەکار لە نەوەی ئیسرائیل کە سەگەکەی بینی، پێڵاوەکەی داناو لە سەرپۆشەکەیەوە بەست بەو شێوەیە ئاوی دەرهێناو سەگەکەی ئاودا، بەهۆی ئەوەوە خوا لە گوناهەکانی خۆش بوو."[2]

ئەبوهورەیرە دەگێڕێتەوە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی" ئافرەتێك سزادرا لەسەر پشیلەیەك، بەندی کرد هەتا مرد، بەهۆیەوە چووە دۆزەخ،

---

١- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٥١٤

٢- صحيح المسلم، رقم الحديث: ٤٢٥٩

چونکە نە ئەوەبوو خۆراك و ئاوی بداتێ کاتێ کە بەندی کردبوو نە ئەوەیش بوو بەرەڵایی بکات خۆی لە جروجانەوەری زەوی بخوات."[١].

لەبیرمان نەچێت ئەو باسەی کە بەشێوەی چیرۆك بگێڕدرێتەوە باشترو زیاتر لەمێشکدا دەمێنێتەوەو بیرناچێتەوە، ئەمەش بۆ منداڵ کارێکی سەرکەوتووانە و گرنگە.

(خەڵاتکردن و رێزلێگرتنیان) لەسەر سەرکەوتن و کارە باشەکان، یەکێکی ترە لە هۆکارە بەنرخەکان بۆ تێگەیاندنی منداڵ و ڕاهێنانی لەسەر متمانەبەخۆبوون و کۆڵنەدان، هەروەك منداڵەکان بەخەڵات کردنیان، باشتر لەجیاوازی کردنی نێوان کام کارە باشە و کامە خراپە حاڵی دەبن.

هەستی پێ ڕازی بوون و نرخاندنی بابەتێك ڕۆڵی زۆر دەبینێت لەتێگەیشتن لەو بابەتەدا، پەروەردەکارانیش سەرنجی سوودو کەڵکی (بەخشش کردن)یان داوە کە خاڵێکی گرنگە بۆ هاندان و پەرەپێدانی تواناکانی منداڵان.

پێغەمبەرمانﷺ وەکو هەموو شێوازێکی تر زۆر بەوردی ئەم شێوازەشی بەکارهێناوە، نموونەیەك وەردەگرین:

گوێ بۆ گێڕانەوەیەکی ئیبن عەباس دەگرین کە دەڵێت:

" ڕۆژێك پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ دەست بەئاو گەیاندن ڕۆیشتن منیش سەتڵێك ئاوم بۆ دەستنوێژ گرتنەکەی ئامادەکرد، پاشان پێغەمبەری خۆشەویستﷺ پرسیاری لەوەکرد کە کێ ئەو ئاوەی بۆ ئامادەکردووە، کە زانی من بۆم ئامادە کردووە لە پاداشتدا ئەم دوعایەی بۆ کردم: "خودایە زانستی دینی ئەو زیاد بکەیت".

---

١- صحيح المسلم، رقم الحديث: ٤٨٥٥

پێغەمبەری خۆشەویستﷺ بەو دوعا گرنگە، ئیبن عەباسی خەڵات کرد لەدوای ئەوەوە ئیبن عەباسیش زیاتر شەوق و خواستی بۆ خزمەتکردن دروست بوو.

ئەنەسی بچووکیش کە ماوەی دە ساڵ لە خزمەت پێغەمبەرداﷺ هەڵسوڕا، زوو زوو دەستخۆشی و پاداشتی لە پێغەمبەری خواوە پێدەگەیشت، ئەمەش زیاتر ئەوی گەرم و گوڕ دەکرد، چونکە بۆ منداڵ شتێك لەوە خۆشتر و باشتر نییە کە پێی بوترێت:

" ئافەرین... چەند باشت کردووە ! "

پێغەمبەری خواﷺ وێنا کردن و هێڵکاری کێشان و لێکچواندنی بە ڕێگەیەکی گرنگ بۆ قایل کردنی منداڵ و مرۆڤەکان دەزانی، کە لە ئێستاشدا پەروەردەکاران بەبایەخەوە تەماشای دەکەن، بۆیە پێغەمبەری سەردار لەبابەتێکدا کە ئاڵۆز بوایەو تێگەیشتنی پێویستی بە توانای زۆر بوایە، بەشێوەی وێنەو هێڵکاری ڕوونی دەکردەوە بە لێکچواندن و لێك نزیککردنەوەش وانەو دەرسی بە هاوەڵان دەدا، پێغەمبەرمان ﷺ لەگەڵ جابر دانیشتبوون، پێغەمبەری خوا لەسەر زەوییە خۆڵەکە ڕێگەی خواو شەیتانی تێدەگەیاند:

جابر بەم شێوەیە دەیگێڕێتەوە:

کاتێك لەتەنیشت پێغەمبەرەوەﷺ دانیشتبووم، لەپێش خۆیەوە هێڵێکی کێشا فەرمووی: "ڕێگەی خوای مەزن، بەم جۆرەیە..."

پاشان لەلای ڕاستی و لەلای چەپیەوە دوو هێڵی تری کێشاو فەرمووی: "ئەمانەش ڕێگەی شەیتانن."

لەپاشان دەستی خستەسەر هێڵەکەی ناوەڕاست و ئەم ئایەتەی خوێندەوە"

(شوێن ڕێگەی ڕاستم بکەون، مەکەونە دوای ئەو ڕێگانەی لەڕێبازی خوای گەورە داتان دەبڕێنێت خوا ئەمەی بەدڵنیایی و بێگومان بۆ ڕوون کردوونەتەوە).

نموونەی دووەم عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود بۆمان باس دەکات:

فەرمووی: پێغەمبەرﷺ خەتێکی چوارگۆشەی کێشا، لەناو ئەو خەتە چوارگۆشەیەوە، خەتێکی تری درێژی کێشا هەتا دەرەوە، ئینجا لەدیوی ناوەوە، چەند خەتێکی تری وردی لەسەر خەتەکەی ناوەوە کێشا، ئەوجا فەرمووی ﷺ: ئەمە وێنەی مرۆڤ و هیوایەتی، ئەم خەتەیان کەوا لەناو چوارگۆشەکەدایە و خەتە وردەکانی وا لەسەر، ئەمەیان وێنەی ئادەمیزادەو، ئەم خەتە چوارگۆشەیەشیان وێنەی ئاکامەکەیەتی، ئەوەتا بەری لێ بڕیوەتەوەو لەهەر چوارلاوە ئابڵوقەی داوە، یا فەرمووی: گەمارۆی داوە و دەوری گرتووە، ئەم خەتەشیان کە دەرچووەتە دەرەوە هیواکەیەتی. ئەم خەتە وردیلانەیەش دەردو بەڵاو مەینەتن، گریمان ئەگەر لە هەندێ لەم دەرد و ئازارانەیش دەربازی بوو لە هەندێکی تریان قوتاری نابێ، سەرەنجام پێش ئەوەی کە بگات بە ئاواتی خۆی، یەکێ لەم دەردوبەڵایانە وەك مار دەیگەزێ .[1]

لەبارەی لێکچواندنەکانی پێغەمبەریشەوەﷺ لە ڕوونکردنەوەی بابەتێکدا ئەبوموسای ئەشعەری دەڵێت:

" پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: " بەڕاستی نموونەی ئەم ڕێنمایی و زانستەی خوای گەورە بە مندا ناردوویەتی وەك بارانێك وایە دەدا لە زەوییەك، ئەو زەوییە بەشێکی بەپیتە ئاوەکە هەڵدەمژێ، ڕووەك و گژوگیای زۆر دەڕوێنێ، هەندێکیشی خاکێکی بێ پیتە ئاوەکەی تیا

---

١- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٦٠٦٢

دەمێنێتەوە و خوا دەیکات بەهۆی سوودی خەڵکی ئاوی لێ دەخۆنەوە و ئاژەڵ و مەزرانی پێ ئاودەدەن، هەر ئەو بارانە دەدات لە پارچەیەکی تری ئەو ئەرزە کە تەخت و کرێنە نە ئاو هەڵدەگرێت و نە گیا سەوز دەکات، ئەم نموونانە بۆ کەسێکە کە شارەزا بوو بێت لە ئاینی خوای گەورە و خوا سوودی پێ بەخشیبێ بەو پەیامەی بە مندا ناردویەتی، خۆی فێربووە و خەڵکیشی فێرکردووە، هەروەها نموونەی کەسێکیشە کە ئەو پەیامەی پشتگوێ خستووە و ئەو ڕێنماییەی وەرنەگرتووە کە منی بۆ ڕەوانەکردووە".[1]

ئەمەش کە لە سەهلی کوڕی سەعدەوە بۆمان دەگێڕێتەوە، ئەوەمان تێدەگەیەنێت کە چۆن پێغەمبەری خوا ﷺ زمانی جەستەی وەکو شێوازێکی کاریگەرو گرنگ لەقسەکردندا بەکارهێناوە، فەرمووی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: "من و دەستەبەرو بەخێوکاری هەتیو لەبەهەشتا ئاوا وەك ئەم دوو پەنجەیە لەنزیك یەکترەوە دەبین." پێغەمبەر ﷺ بە پەنجەی شایەتومانی و بە پەنجەی ناوەڕاستی ئاماژەی کردو تۆزێك لەیەکتر بڵاوی کردنەوە.[2]

لەدوای هەموو ئەمانە لەوە تێدەگەین کە پێغەمبەرمان ﷺ بۆ قایل کردنی منداڵەکان و باشتر تێگەیاندنیان لەبابەتێك، هەموو تەکنیکێکی پەروەردەیی پێویستی لە سەرنجڕاکێشان و گرنگیپێدانی ئەوان بەکارهێناوە، بێگومان ئەو سەلیقەو لێزانینە هەر لە مامۆستای مرۆڤایەتی دەوەشێتەوە، ئەو ئەرکەی دەکەوێتە سەرشانی دایکان و باوکانیش کەڵك وەرگرتنیانە لەم نموونانە.

---

١- صحيح مسلم، رقم الحديث: ٤٣٣١

٢- صحيح البخاري، رقم الحديث، ٥٠٠١

# نموونەیەکی پەندئامێز

## خەڵات کردن

ڕێگەی (خەڵات کردن) کە پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ زیادکردنی گرنگیدان و پەرۆشی بە کارەکانیان لە منداڵاندا بەکاری هێناوە، بووەتە خوویەکی زیندوو پەیڕەوکراو لەلای زانایانی ئیسلامی دوای ئەویش، تایبەت بەم باسە زانای گەورەی ئیسلام ئیبراهیمی ئەدهەم دەگێڕێتەوە:

" باوکم پێی دەوتم: "کوڕم فێری حەدیث (فەرموودە) ببە، هەرکات فەرموودەیەکی تازە ببیستی و لەبەری بکەیت من درهەمێکت دەدەمێ (درهەم پارەی ئەو سەردەمە بووە)". لەبەرئەوە منیش حەزم بە فێربوونی حەدیث کردبوو. ئیمامی ئەبو حەنیفە لەبەرامبەر فێرکردنی کوڕەکەی (حماد) بەسورەتی فاتحە، ٥٠٠ درهەمی بە مامۆستاکەی دابوو، لەزەمەنێکدا کە بە یەك درهەم بەرانێك دەکڕدرا! بەو شێوەیە خەڵاتێکی وا گەورەی بەخشیبوو بە مامۆستایەك لەبەرامبەر فێرکردنی سورەتی فاتحەدا بە کوڕەکەی.

سەرەڕای ئەوەش ئەبو حەنیفە وتبووی:

" ئەوەی کە فێری منداڵەکەمت کردووە بە کەمی مەبینە، ئەگەر پارەی زیاترم هەبووایە ئەوا لەبەر ڕێزو شکۆی قورئان پێم دەدایت".

# پێغەمبەرمانﷺ گرنگی تایبەتی بە منداڵانی هەتیو و بێ کەس دەدا

**ناوەڕۆکی پەروەردەیی**

" من و دەستەبەرو بەخێوکاری هەتیو لەبەهەشتا ئاوا وەك ئەم دوو پەنجەیە لەنزیك یەکترەوە دەبین." [١]

**پێغەمبەرمان موحەممەد ﷺ**

یەکێك لەوانەی کە بەهۆی برینەکەیانەوە خوێنیان لێ دەڕوات لە کۆمەڵگەدا، منداڵانی بێ کەس و لانەوازن، ئەوە زانراوە کە لەهەر کۆمەڵگەیەکدا گرنگی و خۆشەویستی بەوانە نەدرێت و، باوەشی سۆزیان بۆ نەکرێتەوە و ژیان و خوێندنی شایستەیان بۆ دابین نەکرێت ئەوا زەمینە بۆ بڵاوبوونەوە و سەرهەڵدانی هەر جۆرە خووڕەوشتێکی خراپ ساز دەکات.

پێغەمبەری سەردارمان بۆ پێشگرتن بەهەڵسوکەوت و ڕەوشتی زیانبەخش و خراپ لەکۆمەڵدا بەر لە هەرکارێك سەرپەرشتی بێ کەس و هەتیوەکانی کردووەو لەتەنهایی ڕزگاری کردوون، ئوممەتەکەشی لە

---

١- صحيح البخاري، رقم الحديث، ٥٠٠١، پێغەمبەرﷺ بە پەنجەی شایەتومانی و بە پەنجەی ناوەڕاستی ئاماژەی کردو تۆزێك لەیەکتر بڵاوی کردنەوە.

چاودێریکردنی هەتیوەکان ئاگادارکردۆتەوە، بەتایبەتیش ئەو کەسانەی پەیوەستن بە پەروەردە و فێرکردنی منداڵانی بێ کەس و هەتیوەوە، گرنگە کە کەسانی هەستیارو بەسۆزو خۆشویستراوبن. منداڵ تا هەست بە نزیکی و متمانەیی چواردەوری بکات، جوانترو باشتریش ڕەفتار دەکات، ئەگەر بایەخ پێدان و خۆشویستنی لێ دامالرێت ئەوا ڕەنگە زیانی گەورە بە خۆیی و کۆمەڵگەش بگەیەنێت.

پێغەمبەری سەروەرمانﷺ چارەسەری هەمیشە زیندوو و هەڵبژێردراوی بۆ ئەم کێشەیەی کە لە هەموو سەردەمێکدا هەیە بینیوەتەوە، بەیانیەکی جەژن پێغەمبەری خواﷺ لەدوای نوێژ کە دێتەدەر، لە تەنیشت مزگەوت چاوی بەو منداڵانە دەکەوێت کە سەرقاڵی یاری کردنن، منداڵێکی دێتە بەرچاو کە لەسوچێکدا بەغەمباری و بەتەنها دانیشتووە تێکەڵی ئەوانی تر نابێت، جل و بەرگەکانیشی کۆن و شێواو دەبن، ئەم دیمەنە سەرنجی پێغەمبەری میهرەبانﷺ ڕادەکێشێت لەمنداڵەکە نزیك دەبێتەوەو پرسیاری ئەو حاڵەی لێ دەکات.

" بۆچی ئاوا نارەحەتیت؟ بۆ لەگەڵ هاوڕێکانت یاری ناکەیت؟"

" باوکم لەجەنگی ئوحودا شەهید بوو، دایکیشم لەگەڵ کەسێکی تر هاوسەرگیری کرد، منیش بێ خاوەن ماومەتەوە"، پێغەمبەری خواﷺ بەسۆزەوە منداڵەکەی لەئامێز گرت و پێی فەرموو:

" من بە باوکت و عائیشە بەدایکت و فاطمە بەخوشکت قبوڵ دەکەیت؟"

منداڵەکە لەخۆشحاڵیدا خەریك بوو دەفڕی....

" دایك و باوکم فیدات بن ئەی پێغەمبەری خوا ، چۆن نامەوێت! "

پێغەمبەری خوا ﷺ پرسیاری ناوی منداڵەکەی کرد، ئەویش وەڵامی دایەوە:

"بوجەیر (بەمانای ورگ زل)"

پێغەمبەری نازیزمان ئەو ناوەی پێ خۆش نەبوو فەرمووی:

ناوی تۆ با بەشیر (بەمانای موژدەدەر) بێت".

پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی منداڵەکەی گرت و بردیەوە ماڵەوە، خاتوو عائیشە ئەوی شت و قژی بۆ داهێناو بەرگی جوانی لەبەرکردو سکی تێرکرد.

لەپاش ئەوە منداڵەکە کاتێك تێری خواردو جل و بەرگی تازەی پۆشی ئینجا ڕۆیشتەوە ناو هاوڕێکانی بۆ یاریکردن، منداڵەکە خۆشحاڵ بوو و شادمانیەکەشی لە ڕووخساریدا هەستی پێ دەکرا، منداڵەکان کاتێك ئەو گۆڕانەیان لە بەشیردا بینی، بەپەرۆشەوە پرسیاری هۆکارەکەیان کرد، ئەویش پێی وتن:

"پێغەمبەر بوو بە باوکم و عائیشەش بە دایکم، برسی بووم، تێرکرام، شێوابووم بە بەرگی تازە پۆشرام، چۆن خۆشحاڵ نەبم؟!"

ئەم خزمەتەی پێغەمبەری خوا ﷺ دەبێت وانەیەکی زۆر گرنگ بێت بۆ ئێمەش، ئەگەر ئەو بەشیرە بچووکانە لەناو بێ چارەیی و تەنهایی خۆیاندا بمێننەوە، خۆیان و کۆمەڵگەکەشیان لاواز دەکەن"، لەبەرئەوە پێغەمبەری خواش ﷺ ئەم مژدەیەی داوەتە ئەو کەسانەی کە بەدەم هەژارو بێ کەس و هەتیوەکانەوە دەچن:

" هەر موسوڵمانێك سەرپەرشتی هەتیوێك لەئەستۆبگرێت، ئەوا بێگومان جێگەی بەهەشت دەبێت، مەگەر گوناهێکی ئەنجامدابێت کە لێخۆشبوونی نەبێت.[1]

لە فەرموودەیەکی تردا پێغەمبەرمانﷺ دەفەرموێت:

---

١- سنن الترمذي، رقم الحديث: ١٨٨٩

" باشترین ماڵ لەماڵی موسوڵمانانندا، ئەو ماڵەیە کە هەتیوی تێدایە و بەباشی ڕەفتاری لەگەڵ دەکرێت، خراپترین ماڵیش ئەو ماڵەیە کە هەتیوی تێدایەو خراپ ڕەفتاری لەگەڵ دەکرێت".[1] ئاگادارکردنەوەکانی خوای مەزن بۆ ئەو کەسانەی حەقی هەتیو دەخۆن، بەڕاستی ترسێنەرە:

﴿إِنَّ الَّذِينَ يَأْكُلُونَ أَمْوَالَ الْيَتَامَى ظُلْماً إِنَّمَا يَأْكُلُونَ فِي بُطُونِهِمْ نَاراً وَسَيَصْلَوْنَ سَعِيراً﴾ النساء: ١٠. واتە: (بەڕاستی ئەوانەی بە ناحەق و بە ستەم و دەستدرێژی ماڵی هەتیو ئەخۆن ئەوە ئاگر ئەخۆن و ئەو ماڵە ئەبێتە ئاگر لە سکیاناو، لە قیامەتیشدا ئەچنە ناو ئاگری دۆزەخ و تیا ئەبرژێن.)[2]

خاوەنداریکردنی بێ کەس و هەتیوان و دابینکردنی خوێندن و پەروەردەیان و گرنگیدان بە پێویستیەکانیان دەبێتە توێشوویەکی گەورەو نەبڕاوە بۆ مرۆڤ، لەپاداشتیشدا بێگومان بەهەشت چاوەڕێی دەکات.

## نموونەیەکی پەندئامێز

## باڵندەکەم نەخۆشە

یەکێکی تر لە نموونە سەرنجڕاکێشەکانی ژیانی پێغەمبەری خوا ﷺ پەیوەستە بەمنداڵێکەوە کە باڵندەکەی مرداربووبوویەوە.

منداڵێک کە بەغەمگینیەوە لەکەنارێکدا دانیشتبوو بەشداری یاریکردنی منداڵانی هاوڕێی نەدەکرد سەرنجی پێغەمبەری خوای ڕاکێشا، لێی نزیک

---

١- سنن ابن ماجة، رقم الحديث: ٣٦٧٦

٢- خولاصەی تەفسیری نامی، ل:٧٨

بــووەوەو پرســیاری بەشــداری نەکردنەکــەی کــرد لەگــەڵ منداڵەکانــدا، منداڵەکەش وتی: "باڵندەکەم نەخۆشە– لەبەرئەوە نامەوێت یاری بکـەم"، پێغەمبــەرمانﷺ دڵــی منداڵەکــەی دایــەوەو ئــارامی کــردەوە، ئــەویش ڕۆیشتەوە ناو هاوڕێکانی و دەستی کرد بە یاریکردن، دوو ڕۆژ دوای ئـەوە، پێغەمبــەری خــواﷺ کاتێــك دەڕۆیشــت بــۆ مزگــەوت دیســان منداڵەکــەی بەخەمباری لەکەنارێکدا بینییــەوە ڕۆیشــتە لای و هۆکاری ناڕەحەتیەکـەی پرسی:

" بۆچی بێتاقەتیت، شتێك بووە؟"

منداڵەکەش دەستی کرد بە گریان:

" باڵندەکەم مرد"

پێغەمبەری خواش فەرمووی:

" زۆرم پێ ناخۆش بوو، تۆ ئیستا بڕۆرەوەماڵەوە، منیش کەمێکی تر دێم."

لەپاش نوێژ لەگەڵ چەند هاوەڵێك چووە مـاڵی منداڵەکە و دڵنـەوایی کــرد، منداڵــە ناڕەحــەت و خەمبارەکــەش بــەو نــەرم و نیــانی و دڵ ئارامکردنەوەیەی پێغەمبەرمانﷺ گەشایەوەو ئاسـوودە بـوو. بـەم جـۆرە ئەو ئازیزەی کە دۆستایەتی ئەو لەگەڵ مرۆڤەکاندا بێ ئەندازە پـڕ لەسۆزو ڕێزبوو ئەو منداڵەی دووبارە هێنایەوە سەر ژیانی ئاسایی.

ئێمەش وەك دایکان و باوکـان یـاخود پـەروەردەکاران هـەرکات خـاڵی پەیوەسـتی و وابەسـتەیی منداڵـەکانمان بەژیانـەوە لەبەرچـاوگرت زۆرێـك لەکێشـەکانی منداڵـەکان و خێـزان و تەنانـەت کۆمەڵگـەشمان چارەسـەر کردووە.

# پێغەمبەرمانﷺ منداڵانی هاندەدا بۆ فێربوونی زانست

**ئاوەڕێکی پەروەردەیی**

﴿قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَالَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ﴾ الزمر: ٩

واتە: (تۆ بڵێ: ئایا ئەوانەی زانان و ئەوانەی هیچ نازانن وەك یەك وان؟)

کاتێك لە وردەکاریەکانی ژیانی سەرداری مرۆڤایەتی پێغەمبەری ئازیزمانﷺ دەڕوانین، دەبینین کە چۆن هەوڵی داوە تابلۆی مرۆڤی نموونەیی بکێشێت: پێویستە هەر موسوڵمانێك بەکردارو گوفتارو هەڵسوکەوت و خووڕەوشتەکانی نموونەیی بێت و جێگەی ڕێزی هەموان بێت، بەدڵنیایەوە ئەمەش بەستراوە بەزانین و پەروەردەو پێگەیشتنی دروستەوە. پێغەمبەری گەورەشمانﷺ لەبەر بەرزڕاگرتنی نرخی مرۆڤ و پاراستنی ئاسوودەیی کۆمەڵگەو بەرپاکردنی دادپەروەری، گرنگی زۆری بە پەروەردەی منداڵ دەدا. بەهاندانی منداڵان بۆ زانست و زانیاری، ڕادەی بیرکردنەوەو پێگەیشتنی ئەوانی بەرەو پێش دەبرد.

هەروەك پێویستە ڕەچاوی لایەنی دەروونی منداڵ بکرێت و بە شێوازی جۆراوجۆر هان بدرێت بۆ فێربوون، چونکە منداڵەکان بۆ حاڵی بوون لەهەر

بابەتێك پێویستە كە تیایدا بژین، لەم مەسەلەیەدا یاسایەكی بەناوبانگ هەیە: "منداڵەكان ئەوەی دەیبیستن بیریان دەچێتەوە، ئەوەی دەیبینن لێی تێدەگەن، ئەوەش كە تیایدا دەژین فێری دەبن."

هەر بەم جۆرە پێغەمبەری ئازیزمانﷺ كە زۆر بەڕوونی ئاگاداری ئەو وردەكاریە بووە، بە شێوازو ڕێگەی جۆراوجۆر و بەخەڵاتكردن منداڵانی ئاڕاستەی فێربوونی زانست كردووە. هەروەها جارجارە منداڵانی لەگەڵ خۆی دەبردە مزگەوت، لە بەرامبەر هاروهاجیەكانی ناو مزگەوتیشیاندا بێزاری دەرنەدەبڕی، بۆ ئەوەی منداڵەكان خوو بە كەش و هەوای ناو مزگەوتەوە بگرن، لەگەڵ ئەوان بەشیرینترین شێواز مامەڵەی دەكرد.

تەنانەت نەوەكانی دەچوونە سەر شانی و لەناو سوجدەشدا ئەوانی نەدەهێنایە خوار، لەكاتی وتار خوێندنەوەشدا لەباوەشی دایدەنان و قسەی دەكرد، بەم شێوەیە هەوڵی دەدا منداڵەكانیش فێری دانیشتنی مەجلیسی زانست و فێربوون بن، ڕێگری لەو هاوەڵانەش دەگرت كە بەهاروهاجی منداڵەكانی ناو مزگەوت بێزارییان دەردەبڕی، پێغەمبەری خواﷺ منداڵەكانی دەبردە مەركەزی سوففە[1] كە وەك قوتابخانەیەك بوو بۆ فێربوونی سەرەتایی. پێغەمبەری ئازیزمان كە تەقەلای زۆری دەدا بۆ خوێندنی منداڵەكانی لەمەركەزی پەروەردەیی سوففەدا، بەڵام لەبەرئەوەی ئەو قوتابخانەیە وەك پێویست نەبوو، دەستی كرد بە دامەزراندنی قوتابخانە لە ناو گەڕەكەكانی مەدینەدا بەم شێوەیە بە زیادكردنی ڕێژەی فێربووانی خوێندنەوەو نووسین، خوێندنی سەرەتایی منداڵەكان دابین كرابوو، هەروەها ئەو منداڵانەی لەم قوتابخانەیە بوون، جارجارە دەچوونە

---

١- (صُفَّة): شوێنێك بوو لە مزگەوتی پێغەمبەرﷺ كە هاوەڵە هەژارە كۆچكردووەكان لەوێ دەمانەوە و پێغەمبەرﷺ كۆمەكیی دەكردن، ناسرابوون بە ئەهلی (سوففە).

مزگەوتیش گوێیان بۆ وتارو وانەکانی سەرداری جیهان دەگرت، یەکێك لە هاوەڵان بەناوی ( جوندوب) ئەوانەی کە لەپێغەمبەری خواوە فێری بووە، بەم شێوەیە دەیگێڕێتەوە:

" ئێمە وەکو گرووپێك گەنج – هەندێك جار لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دەماینەوە پێکەوە، بەر لە فێرکردنی قورئانی پیرۆز، سەرەتا بنچینەکانی ئیمانی تێدەگەیاندین دواتر قورئان فێردەبووین، بەم شێوەیەش ئیمانمان بەهێزتر دەبوو"[1]. پێغەمبەری خوا ﷺ کە فەرموویەتی: "باشترینتان ئەو کەسەیە کە قورئان فێر دەبێت و کەسانی تریش فێر دەکات"[2] بۆ خۆیشی هەموو کات قورئانی فێری کەسانی تر کردووەو مامۆستایەتی بۆ کردوون، زۆرێك لەو قوتابیانەی کە بۆ خوێندن دەڕۆیشتنە قوتابخانە پێویستیەکانیان لەلایەن پێغەمبەرەوەﷺ دابین دەکرا، هەر بەمجۆرە بایەخی بە یاساکانی پەروەردەکردن و پرۆگرامەکانی فێرکردن دەدا، پێغەمبەری گەورەمان پشتگیری زۆری فێربوونی زمانی بیانیشی کردووە، بەتایبەت داوای لە هاوەڵی بەڕێز (زەیدی کوڕی ثابت) کردووە کە فێری زمانی عیبری و سریانی ببێت.

ئەو خوێندەوارانەی لەجەنگدا بەدیل لەلای موسوڵمانان دەگیران، لەبەرامبەر فێرکردنی دە منداڵ بە نووسین و خوێندنەوە ئازاد دەکران، ئەمە ڕوویەکی زۆر گرنگ و سەرنج ڕاکێشە لە گرنگیدانەکانی پێغەمبەرمانﷺ بە زانست و فێربوون. لەناو ئەو وانانەی کە پێغەمبەری خواﷺ بە ڕۆڵەی مەعنەوی خۆی (ئەنەس)ی دەدا، بنەمای گرنگی

---

١- سنن ابن ماجه: رقم الحديث: ٦٠

٢- صحيح البخاري: رقم الحديث: ٤٧٤٢

فێرکاری سەرەتایی بۆ منداڵان بەدی دەکرێت، هەندێك لەوانە ئەنەس بەم جۆرە دەیانگێڕێتەوە:

" یەکەمین ئامۆژگاری پێغەمبەری خواﷺ بۆم ئەوەبوو دەیفەرموو:

" نهێنی بەهیچ کەس مەڵێ! ئەمین و متمانەپێکراوبە ! "

دایکم و هاوسەرەکانی پێغەمبەری خواﷺ جارویار پرسیاری نهێنی پێغەمبەری خوایان لێ دەکردم، من پێم نەدەوتن ، نهێنی و ڕازی پێغەمبەری خوامﷺ هیچ کات بەکەس نەوت.

"ڕۆڵەکەم، دەستنوێژەکەت بەتەواوی بگرە، تا فریشتەکان تۆیان خۆشبوێت و تەمەنت درێژ ببێت".

" ئەی ئەنەس! کاتێك غوسڵ دەردەکەیت، زیادەڕەوی تیادا بکە، بەم شێوەیە کە لەشوێنی خۆشۆردن دەرچوویت گوناهو هەڵەکانت لەگەڵ خۆ خاوێن کردنەوەتدا ڕۆیشتوون"

منیش پرسیم: "ئەی پێغەمبەری خوا زەیادەڕەوی چۆنە؟"

فەرمووی: "مووەکانت بە باشی تەڕ بکەو قووڵاییەکانیان خاوێن بکەرەوە"

" ئەی ڕۆڵەکەم! تا دەتوانیت دەست بە دەستنوێژ بە، لەبەرئەوەی هەرکەس بە دەستنوێژەوە بمرێت، پاداشتی (شەهیدی) پێ دەدرێت"

" ئەی ڕۆڵەکەم! ئەوەندەی لە دەستت دێت واز لە نوێژەکانت مەهێنە لەبەرئەوەی بەم جۆرە فریشتەکان دوعای ڕەحمەتت بۆ دەکەن."

" ئەی ئەنەس! لەکاتی ڕوکوعدا بەدەستت ئەژنۆکانت بگرە، پەنجەکانت لەیەکتر جیابکەرەوە و ئانیشکت بەخۆتەوە مەنوسێنە، ئەی ڕۆڵەکەم، کاتێکیش لە ڕکوع بەرز دەبیتەوە با هەموو ئەندامەکانت بچنەوە جێی خۆیان بەتەواوی، چونکە خوای گەورە لەڕۆژی قیامەتدا تەماشای ئەوانە ناکات کە لەنێوان ڕکوع و سوجدەکاندا پشتیان ڕاست ناکەنەوە،

ئەی ڕۆڵەکەم! کاتێکیش سوجدە دەبەیت ناوچەوانت و لەپی دەستەکانت تەواو بنێ سەر زەوی. وەك کەڵەشێر کە دەنوك لەزەوی دەدات (بەخێرایی هەستانەوە لە سوجدە) دەنووك لەزەوی مەدە. (بەدانانی قۆڵەکانت لەسەر زەوی لەسوجدەدا) وەکو دانیشتنی سەگ یاخود ڕێویەکان مەچۆرە سوجدە، لەنوێژدا ڕوو بەلای ڕاست و چەپدا مەکە، ئەگەر هەر ئەمەشت کرد لە نافیلە (نوێژی سوننەت)دا بیکە، لە فەرزدا مەیکە. "ئەی ڕۆڵەکەم! کە لەماڵ دەردەچیت، هەرکەست لەئەهلی قیبلە بینی سەلامی لێ بکە، بەم جۆرە بە بەخشراوی دەگەڕێیتەوە ماڵ، ئەی ڕۆڵەکەم! کە دەشچیتەوە ناو ماڵەکەت سەلام لەخۆت و ئەهلی ماڵەکە بکە".

" ئەی کوڕەکەم! هەوڵ بدە بەبێ هێشتنەوەی ڕق و کینە بەرامبەر کەسێك لەناو دڵتدا شەو یان ڕۆژ بکەیتەوە، لەبەرئەوەی ئەگەر لەمەدا سەرکەوتوو بیت، زۆر بەئاسانی حسابەکەی دەدەیت. ئەی ڕۆڵەکەم! ئەگەر گوێڕایەڵی وەسیەتەکەم بیت، هیچ شتێك لە مردن خۆشەویستتر نابێت لەلات"، "حورمەت و ڕێز بەرامبەر گەورەکانی موسوڵمانان و بەسۆزییش بەرامبەر بچووکەکانیان بنوێنە.."

"ئەی ڕۆڵەکەم! زۆر دوعا بکە لەبەرئەوەی بەدڵنیاییەوە دوعا دەبێتە هۆی دەفعی قەزا."

" ئەی ڕۆڵەکەم! ئەمە سوننەتەکەی منە، هەرکەس سوننەتی من زیندووبکاتەوە منی زیندووکردۆتەوە، هەرکەسیش من زیندووبکاتەوە (بناسێت) لەبەهەشتدا لەگەڵ من دەبێت." هاندان و پشتگیرییەکانی پێغەمبەرمانﷺ بۆ فێربوونی منداڵان بە زانست و زانیاری ئێمەش دەخاتە ژێر باری بەرپرسیاریەتی گرنگەوە بەرامبەر منداڵەکانمان.

پێویستە زەمانێکی باش لەپەروەردەکردن و فێربوونی زانستەکانی دین و هونەر بۆ منداڵەکانمان دابین بکەین، چونکە ئەگەر زانستەکانی

دیـین و هونـەر بەڕێـژەی پێویسـت بگەیـەنرێت ئـەوا خۆشـبەختی دنیـاو ئاخیرەت بەدەستدەهێنرێت.

# نموونەیەکی پەندئامێز

## گرنگی زانست

ئـەو هاندانـەی پێغەمبـەری ئازیزمـانﷺ لەبابـەتی زانسـتدا بـە ئوممەتەکەی داوە، بەڕاستی سەرسوڕهێنەرە.

" یان زانا، یان قوتابی ، یان گوێگریە، یاخود ئەمانەت خۆشبوێت، پێنجەمیان مەبە، تیادەچیت! "

" گومـانی تێدانیـە کـە فریشـتەکان باڵـەکانیان بـۆ ئـەو قوتابیانـە دەکەنەوە کە خۆشیان دەوێن، لەڕاستیدا ماسیەکانی ناو ئاو لەسـەر زەوی و هـەموو ئەوانـەی لەئاسمانـەکانن ، دوعـا بـۆ لێخۆشبوونی گوناهـەکانیان دەکەن ، گەورەیی زانایەك کە سەرقاڵی عیبادەت و زانستە وەکو گەورەیی مـانگی پـڕ وایـە بـۆ ئەسـتێرەکانی تـر. بێگومـان زانایـان میراتگـری پێغەمبەرانن، ئەوان لەپاش خۆیان زێڕو زیـو بـەجێ نـاهێڵن، بـەڵکو تـەنها زانست بە میراتـی بـەجێ دەهـێڵن، ئـەوەی زانسـت وەربگرێـت، نسـیبێکی گەورەی بەدەست هێناوە. "

" کاتژمێرێك دانیشتن و سەرقاڵی بەزانستەوە، لەپەرستشی شەوێك تا بەیانی خێرترە".

## پێغەمبەرمانﷺ چاودێری گرووپی هاوڕێیەتی منداڵان و ئەو دەوروبەرەی دەکرد کە تیایدا بوون

**ناوەڕۆکی پەروەردەیی**

**مرۆڤ لەسەر دینی هاوڕێکەیەتی، کەوایە ئاگادارین کە هاوڕێیەتی کێ دەکەن."**

**پێغەمبەرمان موحەممەد ﷺ**

ئاشکرایە پێغەمبەری خواﷺ ڕۆڵێکی کاریگەرو ڕێنموییی کارانەی هەبووە لەو هەوڵە زانستخوازییانەدا کە لەساڵانی کۆتاییدا لەسەر ئاستی گرووپی هاوڕێیەتی و دەوروبەریاندا ئەنجام دەدرا. منداڵ باش بێت یان خراپ هەندێك لەڕەفتارەکانی لە هاوڕێکانیەوە وەردەگرێت، هاوڕێیەتی لایەنی بەکەڵکی هەیە بۆ منداڵ کە یارمەتیدەرە بۆ فێربوونی خووڕەوشتی باش، وەرگرتنی ڕۆڵی گرنگ و کاریگەرو پەیرەوکردنی لەخۆیدا و بینینی شێوازو ڕێبازی تر بۆ تەواوکردنی کەم و کورپەکانی، ئینجا ئەگەر نەکەوێتە ناو گرووپێکی باش لە هاوڕێیانەوە ئەوا کردەوەکانی بەرەو کاری ناپەسەندو نەشیاو دەچێت. کاریگەری باش یان خراپی هاوڕێ لەسەر منداڵ ، زۆر ئاشکرا بەدی دەکرێت.

"مرۆڤ لەسەر دینی هاوڕێکەیەتی، کەوایە ئاگادارین هاوڕێیەتی کێ دەکەن!".[1] پێغەمبەری ئازیزمانﷺ بەم شێوەیە بۆمان دەخاتەڕوو، ئەم ئاگادارکردنەوەیەشی تیشك دەخاتەسەر پەروەردەکردنی منداڵ بۆمان.
ئەم فەرموودەیەی تری پێغەمبەری خواﷺ تایبەتمەندی کاریگەری هاوڕێ لەسەر مرۆڤ زۆر جوان ڕوون دەکاتەوە:

" نموونەی هاوڕێی باش و هاوڕێی خراپ، وەك هەڵگری میسك (بۆنفرۆش)و کوردەمێن وایە، ئەوەی کە میسکی هەڵگرتووە یان پێت دەبەخشێت یان پێت دەفرۆشێت (بە لایەنی کەمەوە) بۆنێکی خۆشی لێوە بۆن دەکەیت، بەڵام کوورەدەمێن یان پۆشاکەکەت دەسوتێنێ، یان بۆنێکی پیسی لێوە بۆن دەکەیت."[2]

ئەم فەرموودەیە کە هاوڕێی باش بە بۆن فرۆش دەشوبهێنێت، کەڵك بینینی دنیایی و ئاخیرەتیمان بەڕوونی لەو هاوڕێیانەوە نیشان دەدات، بۆیە پێغەمبەری گەورەمان زۆر باش دەرکی بەم چەشنە هاوڕێیەتییە کردووە، ئەوەشمان پێ ڕادەگەیەنێت کە ئەو هاوڕێیەتیەی پێچەوانەی ئەمەیانە لەڕووی دنیایی و ئاخیرەتەوە دەبێتە مایەی زیان گەیاندن پێمان، ڕەباحی کوری ڕەبیع بەم شێوەیە دەگێڕێتەوە:

لەگەڵ پێغەمبەری خودا ﷺ پێکەوە دەرچووبووین بۆ جەنگ، رسول الله بەهەر سێ کەسێك و حوشترێکی پێدابوون، دووانیان سوار حوشترەکە دەبوون و سێیەمیشیان حوشترەکەی لەناو بیابانەکاندا بۆ ڕادەکێشان، کاتێك لە گردەکان دەهاتینە خوار رسول الله ﷺ هاتە لای من، منیش لەوکاتەدا بەپێ ڕێم دەکرد، پێی فەرمووم: "ڕەباح ، بەپێ دەڕۆیت ها؟!"

---

١- المستدرك على الصحيحين للحاكم، رقم الحديث: ٧٣٨٧

٢- صحيح االمسلم، رقم الحديث: ٤٨٦٨

وەڵامم دایەوە: "من کەمێك دەبێت لە حوشترەکە دابەزیوم، ئێستا نۆرەی هاوڕێکانمە."

پاشان پێغەمبەر چووە لای هاوڕێکانم ئەوانیش یەکسەر حوشترەکەیان دانیشاندو دابەزینە خوارەوە کە هاوڕێکانم هاتنەوە لام پێیان وتم: "سوار حوشترەکە ببەو تا دەگەڕێینەوە دامەبەزە، ئێمە حوشترەکە ڕادەکێشین و ئاگاداری تۆ دەکەین."

منیش پرسیم:" بۆچی؟"

وتیان: "پێغەمبەری خوا ﷺ لەبارەی تۆوە پێی فەرمووین:

"لەڕاستیدا هاوڕێیەکی ساڵحتان هەیە، باش ڕەفتاری لەگەڵ بکەن"، بەڵێ هەر بەم جۆرە کە هاوڕێیەتی کردنی کەسی باش و چاکەخواز بابەتێکی ئەوەندە گرنگە کە پێغەمبەری خواﷺ لەبارەیەوە فەرموویەتی:

" ئیماندار ئاوێنەی برا ئیماندارەکەیەتی. ئەگەر تووشی ناڕەحەتی بوو با لەسەری لابات."[1]

هاوڕێکان لەلایەن کەسانی خۆشویستراوەوە هەڵدەبژێردرێن، مرۆڤ کەم و کورتی و عەیبەکانی ئەو کەسەی خۆشیدەوێت نابینێت، چاو لە ڕەوشت و ڕەفتارەکانی دەکات، لەبەر ئەوە لەکاتی هەڵبژاردنی هاوڕێدا دەبێت سەرنج بدرێت. چونکە هەڵبژاردنێکی هەڕەمەکیانە بۆ هاوڕێ، ڕەنگە ئەو کەسە دووچاری نەهامەتی و کێشە بکات.

کەسی عاقڵ هەوڵ دەدات هاوڕێیەتی ڕەوشت جوان و لەخواترسەکان بکات، هاوڕێی خراپ تێڕوانینی باشی خەڵکی بەرامبەر بەئێمە لەناو دەبات، چونکە خراپیەکانی ئەوان لەئێمەشەوە دەگلێت، دۆستێکی بێ عەقڵ، لە دوژمنێکی عاقڵ زیانی زیاترە. لە سەید جوبەیرەوە بەم جۆرە

١- سنن الترمذي، رقم الحديث: ١٩٠١

ڕیوایەت کراوە: کەسێکی ئەنصاری هاتە لای پێغەمبەری خواﷺ، کابرا ئەنصارییەکە خەمباربوو، پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی: "دەبینم نارەحەتی، بۆچی؟!"

پیاوەکەش وتی: "یارسول الله شتێك خستومیەتیە بیرکردنەوەوە."

" ئەوە چیە؟"

" ئێمە هەموو ڕۆژێك بەیانی و ئێوارە دێینە حزووری تۆ تەماشای ڕووخسارت دەکەین، دێینە مزگەوتەکەت سبەینێ ئێوە لەگەڵ پێغەمبەران دەبن، لەپلەو مەقامە بەرزەکاندا، بەڵام ئێمە چۆن دەکرێت بگەینە ئێوە؟!

پێغەمبەری خوا هیچ وەڵامی نەدایەوە، تا جوبرەئیلی ئەمین لەلای خوای تەعالاوە ئایەتی ٦٩ی لە سورەتی النساء دابەزاند کە دەفەرموێت: ﴿ وَمَن يُطِعِ اللّهَ وَالرَّسُولَ فَأُوْلَـئِكَ مَعَ الَّذِينَ أَنْعَمَ اللّهُ عَلَيْهِم مِّنَ النَّبِيِّينَ وَالصِّدِّيقِينَ وَالشُّهَدَاء وَالصَّالِحِينَ وَحَسُنَ أُولَـئِكَ رَفِيقاً﴾. واتە: (هەرکەس بەگوێی خوداو پێغەمبەری خودا بکات و لە ئەمریان دەرنەچێ، ئەوە لە ڕۆژی دواییدا هاوڕێی پێغەمبەران و هی ئەوانەیە کە نەفسیان بەرز بووەتەوە بۆ لووتکەی خوداناسی، هەروەها هاوڕێی ئەوانەیە کە لە ڕێگای ئایینی ئیسلامی پیرۆزو لە پێناوی ڕەزای خوادا گیانیان بەخت ئەکەن و شەهید ئەبن و، لەگەڵ ئەوانە ئەبن کە عومریان لە ئیطاعەتی خوداو ماڵیان لە ڕێگای ڕەزامەندیی ئەوا سەرف کردووە. ئەمانەیش باشترین و جوانترین هاوڕێن و ئەوەی لە گەڵیان بێ سەرفرازە.)[١]

فەرموودەیەکی پیرۆز کە لەئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕیوایەت کراوە بەم شێوەیەیە: عارەبێکی دەشتەکی لەپێغەمبەریﷺ پرسی: کەی

---

١- خولاصەی تەفسیری نامی، ل:٨٩

قیامەتــە ئــەی پێغەمبــەری خــوا؟ فــەرمووی:" باشــە چــیت بــۆ ئامادەکردووە؟" وتی: هیچ، بەڵام دەستمایەی دەستم ئەوەیە کە خـودا و پێغەمبەری خودام خۆش دەوێت! تەنیا ئومێدم بـەوە قەوییـە. فـەرمووی: "دەی موژدەت لێ بێ کە تۆ لـە وێـستگەو مەڵبەنـدەکانی قیامەتـدا لەگـەڵ ئەو کەسانە دەبی کە خۆشت دەوێت!" ئەنەس دەفەرموێت: بە هیچی تـر وەك ئەوە شادمان نەبووین، وەك بەو فەرموودەیەی پێغەمبەرﷺ شـادمان بووین"[١].

پێویستە لە ژیانی دنیادا بەوریاییەوە هاورێکانمان هەڵبژێرین بۆئەوەی لــە قیامەتــدا شایســتەی بەدەســتهێنانی ڕەحمــەتی خــواو هــاوەڵێتی پێغەمبەران و ڕاستگۆیان و پیاوچاکان بین، چونکە ئـەو هـاورێو دۆسـتەی بەگرنگیــەوە هەڵنەبــژێردرێت، مــرۆڤ لــە دونیــاو ئاخیرەتــدا تووشــی چەرمەسەریو نەگبەتی دەکات.

کاتێکیش بەڵاو ناڕەحەتی بێت و ئێمە بگرێت، ئەوان دووردەکەونەوەو دەڕۆن. ئــەوەی ئــەوان بــە مرۆڤــەکانی دەوروبەریانــەوە دەبەســتێتەوە بەرژەوەندییــە. لەهــەر کاتێکدا بەرژەوەنــدییان کۆتــایی هــات، ئــەوانیش دۆستایەتیەکەیان کۆتایی پێ دەهێنن و دەڕۆن.

لەکاتێکدا کە دۆستی ڕاستەقینە ئـەو هـاورێو دۆسـتەیە کـە لـەکاتی سەختی و ناڕەحەتییەکاندا هاودەم و نزیکی مرۆڤە.

ئەو هاورێیەش کە لـەکاتی ناڕەحـەتی دەست بەربدات، لـە خراپـەوە تێوەتبگلێنێت و تەنها بیر لە بەرژەوەندی خۆی بکاتەوەو زیـانی مـاددی و مەعنــەوی بگەیــەنێت، هــاورێی خراپــە. ئــەو کەســانەش کــە بەباشــی هاورێکانیــان هەڵنەبــژاردووە لــەزیان ڕزگاریــان نابێــت و دەکەونــە گێــژاوی

---

١- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٣٥٠٦

نەهامەتیـەوە"، پێویسـتە دایکـان و باوکـانیش لـەم بابەتـە گـرنگ و هەستیارەدا ئاگاداربن، تـا بتـوانن سـەرنجی منداڵـەکانیان بـدەن و ژیرانـە مامەڵەیان لەتەکدا بکەن.

## نموونەیەکی پەندئامێز

## چۆن هاوڕێ هەڵدەبژێردرێت ؟

جەعفەری صادق لەبارەی ئەم باسەوە دەڵێت:

" لەگەڵ پێنج جۆر کەس هاوڕێیەتی مەکە:

" لەگـەڵ درۆزن هاوڕێیـەتی مەکـە ! ئەگـەر بـاوەڕی پـێ بکـەی دەخەڵەتێنرێیت، چونکە ئەو لە سەرابێك دەچێت، دوور بەنزیك و نـزیکیش بەدوور نیشان دەدات"

"لەگەڵ گێلدا هاوڕێیـەتی مەکـە ! چـونکە ئەوکاتـەی دەڵێـت سـوودت پێدەگەیەنم ، زەرەر دەگەیەنێت"

" لەگـەڵ چـرووکدا هاوڕێیـەتی مەکـە ! چـونکە ئـەو کاتـەی بەجـددی پێویستت پێ بوو، هاوکاریەکانت لێ دەگرێتەوە"

" لەگەڵ ترسنۆك هاوڕێیەتی مەکە ! چونکە تۆ بەدەسـتەوە دەدات و، لەمەترسیەکدا بەجێت دەهێڵێت و هەڵدێت."

" لەگەڵ خراپەکاردا هاوڕێیەتی دروست مەکە ! چونکە تۆ فیدای یـەك پاروو تەنانەت لەوەش کەمتر دەکات."

پێویسـتە ئـەوە لـەبیر نـەکرێت کـە هەڵبـژاردنی هاوڕێیـەك وەکـو هەڵبـژاردنی ژیانێـك و جیهانێـك گـرنگ و هەسـتیارە، لەبەرئەوەیـە کـە پێغەمبەری ئازیزمانﷺ بایەخی زۆری بەهەڵبژاردنی هاوڕێ داوە".

## پێغەمبەرمانﷺ وردبینی و هەستیاری بەرامبەر پاکوخاوێنی منداڵ نیشان دەدات

**ناوەڕۆکی پەروەردەیی**

"پاك و خاوێنی نیوەی ئیمانە"

**پێغەمبەرمان موحەممەد ﷺ**

پێغەمبەری سەروەرمان لەژیانیدا گرنگی بەخاوێنی ڕۆح و جەستە پێکەوە داوە، بەو ئەندازەیەی هەستیاری لە ئەرك و هەڵسوکەوت لەگەڵ خەڵك و خووڕەوشتەکاندا نیشان دەدا، بەهەمان جۆر بایەخی بە پاکوخاوێنی جەستەش دەدا.

پێغەمبەری ئازیزمانﷺ کە فەرموویەتی: "پاك و خاوێنی نیوەی ئیمانە".[1]

بەشێوەیەکی تایبەت ئامۆژگاری دەوروبەری کردووە بەپاکو خاوێنی و، پێداگری لەسەر ژیانێکی پاك و تەندروست کردووە. ئاشکرایە کە پێویستە خووڕەوشتە جوانەکان لە تەمەنی بچووکیەوە فێربکرێن، ئەگەر ئەمە پەیڕەوبکرێت، منداڵەکانیش لەلایان دەبێتە خوونەریت، لەبەرئەوە

---

١- صحیح المسلم، رقم الحدیث: ٣٥٤

پێغەمبەری ئازیزمانﷺ هەر لە تەمەنی بچووکییانەوە، منداڵانی فێری پەیوەست بوون بە پاکوخاوێنی ڕۆحیی و جەستەییەوە کردووە.

بەفەرمایشتی: "ئەوانەی لەئێوە دێنە نوێژی هەینی، با خۆیان بشۆن" گرنگی تایبەتی بەپاك ڕاگرتنی ڕۆح و جەستە نیشان داوە.

"سیواك بەکاربهێنن، چونکە سیواك ناو دەم پاك دەکاتەوە".[1]

" ئەگەر بمزانیایە نابێتە بار قورسی بۆ ئیمانداران ، فەرمانم دەکرد لەهەموو نوێژێکدا سیواك بەکاربهێنن".[2]

بەم فەرموودە پیرۆزانەی پێغەمبەری ئازیزمانﷺ سەرنجمان بۆ پاك ڕاگرتنی دەست و دەم و ددانەکانمان ڕادەکێشێت، جگە لەمانەش ڕێنمایی کردووین بەبڕینی نینۆکەکان و پاك ڕاگرتنی جل و بەرگ و سەرتاشین و لابردنی مووی زیادەی لەش. قژی بۆ منداڵان بڕیوەو فەرمانی بە چاودێری کردنی پاك و خاوێنی منداڵان داوە.

نموونەیەکی پڕ بایەخ لەگرنگیدانی پێغەمبەری ئازیزمانﷺ بە پاك و خاوێنی لاشەو جل و بەرگ :

" یەکێك لەئێوە پرسیاری ڕۆژی دواییمان لێ دەکات، لەحاڵێکدا نینۆکەکانی درێژبوونەتەوەو پیسی و پاشماوەی خواردن بە جلەکانیەوەیەتی. مەیەنە لای من ئەگەر ددانتان زەرد هەڵگەڕاو و، بۆنی ناخۆش لەدەمتان دەهات."

ئەم فەرموودەیەی دیکەی پێغەمبەرمانﷺ تا بڵێی گرنگە:

" ئەی عەلی نینۆکە درێژبووەکانت ببڕە، چونکە شتی زیانبەخش لەژێر نینۆکەکاندا دەمێنێتەوە."

---

١- صحيح البخاري، رقم الحديث: ١٨٤٧

٢- صحيح مسلم، رقم الحديث: ٣٩٦

بایەخی زۆری ئەم چەسپاندنەی لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا بەباشی زانراوە. ئەم فەرمانانەی پێغەمبەری خوا لە باسی پاك ڕاگرتنی لاشەدا، هەموو شتێکی لەبەرچاو گرتووە.

**دە شتی پێویست و گرنگ:**

ڕێك کردنی سمێڵ، درێژکردنەوەی ڕیش، بەکارهێنانی سیواك، ئاو وەردان لە لووت و پاککردنەوەی، شتنی ناو دەم و ددان بە ئاو، بڕینی نینۆکەکان، شتنی نێوان پەنجەکان، لابردنی مووی زیادەی لەش، کورت کردنەوەی قژی سەرو پاککردنەوەی بەئاو."[1]

پێغەمبەری ئازیزمان بەتایبەت لەباسی پاککردنەوە بەئاودا، هاوەڵانی ئاگادارکردۆتەوە. ئایەتی ١٠٨ لەسورەتی (التوبة) لەسەر خەڵکی قوبا هاتۆتە خوارەوە کە بۆ پاککردنەوە ئاویان بەکارهێناوە:﴿فِيهِ رِجَالٌ يُحِبُّونَ أَن يَتَطَهَّرُواْ وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُطَّهِّرِينَ﴾ ، ئەو کاتەی ئایەتەکە ڕەوانەکرا، پێغەمبەری خوا ﷺ ڕووی کردە ئەنصارەکان (پشتیوانان) لێی پرسین: "ئەی کۆمەڵی پشتیوانان ، خوای گەورە لەبابەتی پاك و خاوێنیدا ستایشی ئێوەی کردووە، ئەو پاکو خاوێنیەتان چۆنە کە ستایش کراوە؟"

ئەوانیش وتیان: "ئێمە بۆ هەر نوێژێك دەستنوێژ دەگرین، لەکاتی لەشگرانی خۆمان دەشۆین و بەئاویش خۆمان پاك دەکەینەوە."

پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: "کەواتە ئەو ستایشە لەبەر ئەمە بووە! لەسەر ئەم کارەتان بەردەوام بن".[2]

ئەگەر لەباسی پاك و خاوێنیدا لە فەرموودەکانی پێغەمبەرمان ﷺ وردبینەوە، فێرمان دەکات کە پێویستە خواردنەکانیش پاك ڕابگیرێن، ئەم

---

١- صحيح مسلم، رقم الحديث: ٤١٠

٢- سنن ابن ماجه، رقم الحديث: ٣٥٢

پاك و خاوێنیەش تەنها لەوەدانیە كە بەر لەخواردن پاك بكرێتـەوە، بـەڵكو لەهەمان كاتدا بەمانای ئەوە دێت كە خواردنی حەڵاڵ بخورێت"

لەڕاسـتیدا ئایەتـە پیرۆزەكـانی قورئـانیش سـەرنجمان بـۆ ئەمـە ڕادەكێشن.

"﴿ يأَيُها الذينَ آمنوا كُلوا من طيبات ما رَزَقنا كُم...﴾ البقرة: ١٧٢.

"﴿ يأيها الذين آمنوا لاتحرموا طيبات...﴾ المائدة: ٨٧-٨٨.

خـوای گـەورە لەباسـی پاكوخـاوێنی بـەرگ و پۆشاكیشـدا ئاگادارمـان دەكاتەوە.

﴿ يا بنى آدم قد أنزلنا عليكم لباساً...﴾الاعراف: ٢٦

﴿ يابنى آدم خُذُوا زينَتَكُم عندَ كُلِ مَسجِدٍ ﴾الاعراف: ٣١-٣٢

لـەم ئایەتـە پیرۆزانـەوە بـەڕوونی لـەوە تێدەگـەین كـە خـوای گـەورە پۆشاك و زینەی ڕازاندنەوەی وەكو نیعمەت بە مـرۆڤ بەخشـیووە، دوور لـە زیـادەڕەوی و خۆدەرخسـتن ، پۆشـینی بـەرگی خـاوێن و سـادەو ڕازاوە ئەركی سەرشانی موسوڵمانە.

مـرۆڤ بـەگوێرەی سروشـتی بـەدیهێنانی پاكوخاوێنـە، پاكوخـاوێنی لەسەروو هەموو بنەماكانی فیترەتەوە دێـت: ﴿إن الله يُحِبُ التـوابين ويُحِبُ المُتطهرين﴾ البقرة: ٢٢٢، ئەم ئایەتە و چەندین ئایـەتی هاوشـێوەی مرۆڤـی موسوڵمان بەرەو پاكوخاوێنی ئاڕاستە دەكەن.

بۆیە پێغەمبەری ئازیزمان پاكوخاوێنی ماددی و مەعنەوی هەر مرۆڤێك لەتەمـەنی منداڵییـەوە فێركـردووە، ئەگـەر لەتەمـەنی منداڵیـدا ڕۆشـنبیری پاكوخاوێنی بنیاتبنرێت لەمرۆڤێكدا، بەدرێژایی تەمەنی ژیانێكی نموونـەیی بەسەردەبات لەبەرئەوە پێویستە دایك و باوك بەژیانی خۆیان ببنە نموونەو سەرمەشق بۆ منداڵەكانیان تا لە بواری پاكوخاوێنیدا چاویان لێ بكەن.

## نموونەیەکی پەندئامێز

## خوا پاکی خۆش دەوێت

پێویستە ئەوە لەبیر نەکرێت کە یەکەمین مەرجی تەندروستیەکی باش و، یەکـەمین چارەسـەری گـرنگ بەرامبـەر نەخۆشـیەکان پاکوخاوێنییـە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت:

" خـوا جوانـەو جـوانی خۆشـدەوێت، بەخشـندەیەو بەخشـندەی خۆشدەوێت، کەریمەو کەریمی خۆشدەوێت، پاکەو پاکی خۆشدەوێت"

" دەوروبەری ماڵەکانتان پاك ڕابگرن."

لـەم فەرموودانـەدا پێغەمبـەرمانﷺ تـەنها پاکوخـاوێنی لاشـە لەبەرچـاوناگرێت، بـەڵکو ئامۆژگاریشـمان دەکـات بـەپاك ڕاگرتنـی ژینگـەو دەوروبەری ماڵەکانمان.

# پێغەمبەرمانﷺ بەڵێندانی درۆی بە منداڵان قەدەغە کردووە

**ناوەڕۆکی پەروەردەیی**

"ئەوەی غەش(فێڵ) بکات لە ئێمە نییە."

**پێغەمبەرمان موحەممەد ﷺ**

فریودان و نەبردنە سەری بەڵێن و درۆکردن و ناپاکی لەپەیوەندی نێوان مرۆڤەکاندا، ڕەوشتگەلێکی بێزراو و نەخوازراون، لەسەردەمی ئەمڕۆشماندا (درۆنەکردن لەگوفتاردا و ڕاستی و دروستی) لەو خوڕەوشتانەن کە لەلایەنی باوەڕو متمانە پێکردنەوە خەڵك بەشەوقەوە لە دووییان وێڵن.

پێغەمبەری ئازیزمانﷺ بەگوفتارو کرداری دەریخستووە کە فریودان و خەڵەتاندن و درۆکردن مەترسی گەورەن لەسەر کۆمەڵگە، ڕۆژێك پێغەمبەری خوا ﷺ لەبازاڕ دەچێتە لای گەنم فرۆشێك، دەست بەناو گەنمەکەیدا دەکات ، هەست بە تەڕی پەنجەکانی دەکات لەناو گەنمەکەدا، لەگەنم فرۆشەکە دەپرسێت:

" ئەی گەنم فرۆش ئەمە چییە؟"

خاوەنی گەنمەکەش دەڵێت:

" ئەی پێغەمبەری خوا، باران لەسەری باریوە"

" ئەوەی کە تەڕبووە بتهێنایەتە سەرەوەی گەنمەکە، تاکو خەڵك بیبینێت، ئەوەی غەش(فێڵ) بکات لە من نییە".[1]

درۆکردن و فریودان و ناپاکی هەرگیز لە موسوڵمان ناوەشێنەوە و، ئەوەی بەم کارانە هەستێت وەك لەم ڕووداوەدا بیستمان (لەئێمە نییە)، بەڕاستی ئەمە باسێکە پێویستە هەمووان زۆر باش بیری لێ بکەینەوە.

ئەم نموونەیە گرنگی باوەڕو متمانەی نێوان مرۆڤەکانمان زۆر بەڕوونی تێدەگەیەنێت، پێغەمبەری ئازیزمان ﷺ کە زانیویەتی درۆ و فریودان چەندە خوویەکی زیانبەخشی ناو کۆمەڵگەیە، لەپەروەردەکردنی منداڵیشدا سەرنجی ئەوەی داوەو لەسەری وەستاوە، چونکە منداڵێکی پاك و بێگەرد لە لەدایك بوونیەوە، لەلایەن دایك و باوك و هاوڕێوە فێری درۆ دەکرێت و پاشان دەبێتە خوویەکی جێگیرو وازلێنەهێنراو لەو مرۆڤەدا، لەبەر ئەوە پێغەمبەر ﷺ زوو زوو باسی لە درۆکردن کردووە کە ڕەوشتێکی نەخوازراو و بێزراوە لە لای خوای گەورە. لێرەدا چەند فەرموودەیەکی پێغەمبەری خوا ﷺ لەبارەی ئەم باسەوە دەخەینەڕوو:

" ڕاستگۆیی، مرۆڤ دەگەیەنێتە باشیەك کە خوا لێی ڕازیە، باشیش مرۆڤ دەگەیەنێتە بەهەشت، کەسێك ڕاست دەڵێت و ڕاستی دەوێت تا لە ئەنجامدا لای خوا بە ڕاستگۆ تۆمار دەکرێت. درۆکردنیش مرۆڤ دەباتە خوارەوە ئەوەش لەدۆزەخدایە. ئەو کەسە درۆ دەکات و بەشوێن درۆوەیە تا لەلای خوای گەورەش بەدرۆزن تۆمار دەکرێت".[2]

١- صحيح مسلم، رقم الحديث: ١٧٢

٢- صحيح مسلم، رقم الحديث: ٤٨٢٧

" چوارشت هەرکەس تیایدابێت ئەوە مونافیقی تەواوە، هەرکەسیش یەکێکیانی تێدابێت ئەوە سیفەتێکی مونافیقی تێدایە، هەتا دەستی لێهەڵدەگرێت، هەرکات قسەی کرد درۆ بکات، هەرکات پەیمانی دا بیشکێنێت ئەگەر بەڵێنی دا سەرپێچی لێ بکات، ئەگەر دژایەتی کەسێکی کرد لە هەق لایدات و ستەمی لێ بکات".[1]

" دووڕوویی وەکو خاڵێکی ڕەش وایە لەدڵدا، تا زیاتر بێت دڵ زیاتر ڕەش دەبێتەوە، ئەگەر دووڕوویی گەیشتە لوتکە ئەوا هەموو دڵ ڕەش دەبێتەوە".[2]

گێڕانەوەیەکی صەفوانی کوڕی سولەیم قووڵبوونەوەی زیاتر بەم باسە دەبەخشێت:

لەپێغەمبەریانﷺ پرسی:

– ئەی نێردراوی خوا ! دەگونجێت ئیماندار ترسنۆك بێت ؟

– بەڵێ دەگونجێت..

بەم شێوەیە بەردەوام بوو.

–ئەی دەگونجێت ئیماندار چرووك بێت؟

– بەڵێ دەگونجێت...

– دەگونجێت ئیماندار درۆزن بێت؟

– نەخێر، هەرگیز!...

ڕاستگۆیی دایکی هەموو باشیی و جوانیەکانە، درۆش دایکی هەموو پیسی و خراپیەکانە، پێویستە هەموو موسوڵمانێك نیوەندێکی باش بۆ

---

١- صحيح مسلم، رقم الحديث: ١١٣

٢- الذهد والرقائق لابن مبارك، رقم الحديث: ١٤١٧

منداڵەکەی دابین بکات و لەنێوەندی خراپ دووری بخاتەوە، لەبارەی ئەمەشەوە خوای گەورە دەفەرموویت:

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اتَّقُواْ اللّهَ وَكُونُواْ مَعَ الصَّادِقِينَ﴾ التوبة: ١١٩، بەڵێ ئەمە مەیدان و جێگەی موسوڵمانە، پێکەوەبوون لەگەڵ ڕاستگۆکان، بە تێپەڕبوونی هەر ڕۆژێك چاو لەوان دەکات تا کاتێك دێت وەکو یەکێك لەوانی لێ دێت.

ئەو بابەتەی پێویستە دایك و باوك بەبایەخەوە سەرنجی بدەن، ئەوەیە کە ئەوکاتەی هەست دەکەن منداڵەکەیان مەیلی ڕاست نەوتن و درۆکردن دەکات، هەڵنەکوتنە سەری و لەجێی توورەبوون بەشوێن هۆکارو پاڵنەرەکانیدا بگەڕێن و بنبڕی بکەن، چونکە درۆکردن لای منداڵان چەند هۆکارێکی هەیە، هەندێك لەدیارترین و گرنگترینیان باس دەکەین:

*درۆکانی هێزی خەیاڵیی لای منداڵان: منداڵان لەبەرئەوەی هێزی خەیاڵ کردن لەلایان زۆر فراوانە، هەربۆیە ئەو شتانەی کە ڕوویان نەداوە، بەجۆرێك دەردەخەن کە ڕوویانداوە، لەکاتی دەربڕینی ڕاستیەکانیشدا بابەتەکان گەورە دەکەن و زیادەی پێوە دەنێن. ئەو منداڵەی لەکاتی جووڵانەوەی پەردەیەکدا دەڵێت: "جانەوەرم بینی" درۆی نەوتووە، خێزان ئەوە بەدرۆ لەقەڵەم دەدات و توورە دەبێت، کە ئەمە بەم شێوەیە چارەسەر نابێت .

*ئەو درۆیانەی بۆ ڕاکێشانی سەرنجی ئەوانی تر دەکرێت:

ئەو منداڵەی بەهۆی نەبوونی خاوەنێکەوە هەست بە فەرامۆش کردن دەکات، ڕەنگە پەنا بباتە بەر درۆکردن. ئەو منداڵەی وابیربکاتەوە کە لەلایەن خێزانەکەیەوە خۆشەویستی و بایەخی پێ نادرێت، ڕەنگە هێرش کردنی کەسێك بۆ سەری و پەلاماردانی بەدرۆ هەڵبەستێت، هەندێك جاریش منداڵ بۆ دەربڕینی حەسرەتێکی ناو دەروونی، درۆیەك دروست دەکات.

*ئەو درۆیانەی وەکو مۆدێل و خوویان لێ هاتووە:

منـــداڵێك کاتێـــك دەبیســـتێت دایکـــی بەتەلـــەفون قســـەدەکات و بەهاورێکـەی دەڵێـت لەبەرئـەوەی نەخۆشـم نـاتوانم بـێم بـۆ لات، ڕەنگـە ئەویش فێری ئەو جۆرە درۆیە ببێت.

*ئەو درۆیانەی لەکاتی پێشهاتێکی چاوەڕواننەکراودا دەکرێن:

منداڵان لەبەرئەوەی ئومێدو ئایندەی خێزانن، بـۆ لەدەسـتنەدانی ئـەو خۆشەویستیەی خێزانـەکانیان، ڕەنگـە پـەنا بـۆ درۆکـردن ببـەن، هـەوڵ دەدەن خێزانەکەیان لە هەستی نائومێـدبوون بپـارێزن بـەوەی کـە دەڵـێن: یەکەم بووم، من زیرەکترینم، بەم شێوەیە خۆیان دەبەنە پێشەوە.

*درۆکردن بۆ خۆپاراستن:

ئـەو کاتـەی منـداڵ ڕوونکردنەوەیـەکی باشـتری پـێ نـەبێت، بـۆ خۆپاراستن لە سزادان پەنا بۆ درۆکردن دەبات .

*ئەو درۆیانەی خووڕەوشت خراپ دەکەن:

هەنـدێك جـار درۆ دەرئـەنجامی بـاری خراپـی منداڵەکەیـە، ئەوکاتـە مەترسیدارە کە بەگشتی دزی کردن لە هاورێکەیی و ڕاکردن لەقوتابخانـەو شتی تریشـی لـێ دەکەوێتـەوە، بـۆ ئـەو منداڵانـەی ئـەم درۆیانـە دەکـەن بەدڵنیاییەوە دەبێت داوای یارمەتی لە پسپۆڕی پەروەردەیی بکرێت.

دایکان و باوکـان بەسـەلماندنی خۆیـان وەکـو نموونەیـەکی جـوان بـۆ منداڵـەکانیان و ئاگـادار بوونیـان لـەو شـتانەی لەدەوروبـەری خۆیـان و لەمنداڵەکانیاندا دەیبینن، دەتوانن منداڵەکانیان لە درۆ و خووە خراپـەکان بپارێزن. لەم باسەدا ئەم ئایەتە پیرۆزە نەخشە ڕێگا بـۆ هـەر موسـوڵمانێك دیاری دەکات: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَقُولُوا قَوْلاً سَدِيداً* يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَالَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَن يُطِعْ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزاً عَظِيماً﴾ الأحزاب ٧٠-٧١ ، واتە: (ئەی ئەو کەسانەی ئیمانتان هێناوە ! لە خوا بترسن

و قسەیێ بکەن کە ڕاست و دروست و دامەزراویێ. ئەگەر وابن خوا کارو کردەوەکانتان بۆ باش ئەکاو تاوانەکانتان بۆ ئەپۆشێ و، هەرکەسیش بە فەرمانی خواو پێغەمبەری خوا بجوولێتەوە ئەوە سەرکەوتنێکی گەورەی دەست کەوتووەو گەیشتووە بە پایەیەکی بڵند کە ئەوەتە لە دنیادا کرداری چاك بووەو لە قیامەتیشا بەهەشتی بەرین جێیەتی.)[1]

## نموونەیەکی پەندئامێز

## هەڵخەڵەتاندن درۆکردنە

پێغەمبەری خوا ﷺ گوێی لەدەنگی ئافرەتێك بوو بانگی منداڵەکەی کرد: " وەرە بۆ ئێرە ، شتێکت پێ دەدەم! "

یەکسەر لەئافرەتەکەی پرسی:

" چی پێ دەدەیت؟"

ئافرەتەکە وەڵامی دایەوە:

" ویستم کە هات خورمای پێ بدەم"

پێغەمبەری خوا فەرمووی:

" ئاگادار بە ئەگەر هیچت پێ نەدایە، درۆیەکت لەسەر دەنووسرا".

---

١- خولاصەی تەفسیری نامی، ل: ٤٢٧

## پێغەمبەرمانﷺ دەیویست منداڵان بەرنامەی ڕۆژانەیان هەبێت

**ناوەڕۆکی پەروەردەیی**

" باشترین کردەوە لای خوای گەورە ، ئەوەیە کە بەردەوام بێت هەرچەندە کەمیش بێت."

**پێغەمبەرمان موحەممەد ﷺ**

ئەگەر سەرنجی ژیانی مرۆڤە سەرکەوتووەکان بدرێت، ئەوە بەدی دەکرێت کە بەدرێژایی تەمەنیان بەگوێرەی بەرنامەیەك ژیاون، کەسانێکیش کە خوویان بە یاساکانی کارکردن و بەرنامەی ژیانیانەوە نەگرتبێت ، بەدڵنیاییەوە چاوەڕوانی سەرکەوتنیان لێناکرێت.

خاوەنی ژیانی نموونەیی و پێشەنگی موسوڵمان، پێغەمبەری ئازیزشمانﷺ هەستیارییەکی تایبەتی بەرامبەر کارکردنی دروست و بەرنامەڕێژی لەژیاندا نیشانداوە، بۆئەوەی ژیانیش بگاتە ئاستێك لە بەرنامەڕێژی و ڕێکخراوی، پێویستە لە تەمەنی بچووکیەوە منداڵەکان لەسەر ئەم خووە ڕابهێنرێن، وەکو هەر باسێکی تریش دەبێت منداڵەکان لەدایك و باوکیانەوە ئەم هەڵسوکەوتە ببینن و لەسەری ڕابێن. بەدڵنیاییەوە منداڵێکیش لەخانەیەکی بێ پلان و بێ بنەماو بەرنامەدا

گـەورە ببێـت، چاوەڕوانی كـاری بەبەرهـەم و سـەركەوتنی لـێ ناكرێـت، پێغەمبەری خۆشەویستمانﷺ كە زۆر بـاش ئـەم لایەنـە گرنگـەی زانیـوە، هەمیشە داخوازی ئەوە بووە پـلان و بەرنامەڕێـژی بكرێتـە خوونـەریت لای منداڵان.

ڕیوایەتەكان باس لەو بەرنامە وردو پلانـە پـڕ حیكمەتانـە دەكـەن كـە پێغەمبـەرمان ﷺ بـۆ منــداڵان دایدەڕشــت و سەرپەرشــتی جێبــەجێ كردنەكەشـی دەكـرد، پێغەمبـەری خـوا ﷺ منـداڵانی بـۆ نوێـژی بـەیانی هەڵدەستاند، هەركات بۆ نوێژی بەیانی لەمزگەوت منداڵانیش هەبونایە ئەوا لەبەر بێزار نەبوونی ئـەوان نوێژەكـەی كـورت دەكـردەوە، لـەپاش ئـەنجام دانی نوێژی بەیانی دەیویست منداڵەكان بچنەوە خەوتنیان تەواو بكەن.

پێغەمبــەر ﷺكــە ئــەركی بــە منــداڵان دەســپارد، چــاودێری ئەنجامدانەكەشی دەكردو بـێ سەرپەرشـتی وازی لـێ نـەدەهێنان، ڕۆژانـە لـەكاتی دیـاریكراودا بـۆ یـاریكردن هـانی دەدان، سـەروەرمان دەیویسـت منـداڵان لـەكاتی گـەرمای نیـوەڕۆدا لەماڵـدا بمێننـەوە، ئـەم بەسـەرهاتەی فاطمـەی كچـی پێغەمبـەر ﷺ دەیگێڕێتـەوە هۆكـاری ئـەوەمان بـۆ ڕوون دەكاتەوە:

ڕۆژێك پێغەمبەرمان ﷺ هەواڵی حەسەن و حوسەینی پرسی ، منیش وتم باوكیان –حەزرەتی عەلی– ئەوانی بردووە، پێغەمبەر ﷺدەستی كرد بەگـەڕان بەشـوێنیانداو لەحوجرەیـەكی ئـەو نـاوەدا بینینـی، كـەمێك خورماشی پێ بوو، فەرمووی:

"ئەی عەلی ! پێش ئەوەی گەرما بیانبـات ، منداڵـەكان ناگەڕێنیتـەوە مـاڵ؟ ئێسـتا كـاتی نوێـژی نیـوەڕۆ و نـان خـواردن و قەیلولەیـە –خـەوی نیوەڕوان–.

بەم هەڵسوکەوتەی پێغەمبەری ئازیز ﷺ لە وردی و گرنگیپێدانی ئەو بەرامبەر بەرنامەڕێژی کاری ڕۆژانەی منداڵان حاڵی دەبین، ئەگەر منداڵ لەنیوەڕۆدا لە ماڵەوە بمێنێتەوە ، لەگەرمای ئەو کاتە پارێزراو دەبێت و، لەگەڵ ئەندامانی خێزاندا نان دەخوات و خەوی سوننەتی نیوەڕوان (قیلولە)ی دەکات، ئەمانەش بۆ پێگەیشتنێکی تەندروستی ئەو منداڵە سوودبەخش دەبێت. پێغەمبەری خوا ﷺ ئاگاداری دەکردنەوە کە منداڵان بەر لە خۆرئاوابوونی ئێواران بچنەوە ماڵەوە، ئەمەش خوویەکی زۆر باش و پێویستە بۆ منداڵان، ئەو لێکۆڵینەوە زانستیانەی کە لەم بابەتەدا کراون نیشانی دەدەن ئەو کوڕە پێگەیشتوانەی کە ئێواران درەنگ دەگەڕێنەوە ماڵەکانیان، ئەوانەن کە لەکاتی منداڵیاندا ڕاهاتوون بەدرەنگ ڕۆشتنە ژوورەوەو گەڕانەوە بۆ ماڵەوە لەکاتی ناڕێك و نادروستدا.

لەچالاکیە پەروەردەیی و فێرکارییەکانی پێغەمبەردا ﷺ لەگەڵ دانانی بەرنامە بۆ کاروژیانیان، منداڵانی بەپیادەڕەوی و گەڕانیش ڕێنمایی کردووە، ئەمەی لەناو منداڵانی دەوروبەری خۆیدا جێبەجێ کردووە.

پێویستە دایکان و باوکان ژیانی بەپلان و بەرنامەڕێژی بۆ کراو لەلای منداڵەکانیان بکەنە خوو، تاکو ئەوانیش هۆگرییان بۆی هەبێت، ئەگەرنا چاوەڕوانی سەرکەوتن و داهاتوویەکی بەهرەمەندانە لەمنداڵەکانیان ناکرێت.

# نموونەیەکی پەندئامێز

## بەرنامەی ڕۆژانەی پێغەمبەرمانﷺ

بناغەی بەرنامەی ڕۆژانەی پێغەمبەرمان ﷺ لەسەر ئەنجامدانی ڕێك و پێکی پێنج نوێژەکەی دانراوە. پێغەمبەرمان ﷺ لەدوای خۆرئاوا بوون، ئەوەی کە دەمایەوە لەکاری ڕۆژانەی "کاری دنیایی" دەستی لێ هەڵدەگرت، بەڵام ئەمە بەتەواوی بەمانای گەڕانەوەی بۆ کاتی پشوو نایەت، چونکە ئەو حەزی نەدەکرد کەسێك بەر لەنوێژی عیشا بخەوێت و لەپاش کاتی نوێژ هەستێتەوە لەخەو بۆ گفتوگۆو مانەوە، لەدوای هاتنەوە ماڵی و ئەنجامدانی نوێژی عیشا، کاتی شەوانەی بۆ سێ بەش جیادەکردەوە:

بەشێکی بەپەرستشەوە بەسەردەبرد، بەشێکی لەگەڵ هاوسەرەکانی دەمەتەقێی دەکرد و بەشەکەی تریشی دەخەوت. لەو ژوورەی کە تیایدا دەخەوت سێ قاپی سەرداپۆشراوی پڕ لە ئاو دەبینرا کە یەکێکیان بۆ دەستنوێژو یەکێکی تر بۆ خواردنەوەو ئەوی دیکەش بۆ پاککردنەوەی دەم و ددانەکانی، لەپێش خەوتن هەموو شەوێك ددانەکانی سیواك دەکرد، کە لەنیوەی شەویشدا بەخەبەر دەهات یاخود بەیانیان هەڵدەسا، یەکەمین شت کە دەیکرد سیواك کردنی ددانەکانی بوو، لەدوای نوێژی بەیانی و تا کاتی هەڵهاتنی خۆر لەمزگەوتدا دەمایەوە، گفتوگۆی لەگەڵ هاوەڵان دەکرد و گوێی بۆ کێشەکانیان دەگرت.

لەلایەکی دیکەشەوە ئەمە ئەوەمان نیشان دەدات کە پێغەمبەری خوا ﷺ سەردانەکانی لای خۆی لەکاتی دیاریکراودا ڕێکخستبوو، خاتوو حەفصەی هاوسەری باس لەوە دەکات کە لەهەندێك کاتدا ڕێگەی

بەسەردانی هیچ کەس نەداوە بۆ لای تەنانەت هاوسەرەکانیشی، حەزرەتی عەلیش ﷺ دەگێڕێتەوە کە دووجار -یەکێك لەڕۆژ و یەکێك لەشەودا- ڕێگەی دەدرا بچێتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ سەردانەکانی خۆیشی هەمیشە لەکاتی دیاریکراودا دەکرد، هەموو ڕۆژێك لەهەمان کاتدا دووجار سەردانی ئەبوبەکری دەکرد، جارێك لەبەیانیداو جارێکیش لە ئێوارەدا، ئەم ڕێکخستنە ناوازەیە ڕێسایەکی نەشکێنراو بوو، هەر بۆیە کاتێك بڕیاری کۆچ کردن درا و پێغەمبەری خوا لەکاتی دیارینەکراودا خۆی گەیاندبووە ئەبوبەکر ﷺ، ئەم پێشهاتە بەسەرسامیەوە پێشوازی لێ کرابوو (لەکاتێکدا کە دیاری نەکرابوو هات)، بەپێی ئەوەی لەڕیوایەتەکاندا گێڕدراوەتەوە.

سەردانی هاوسەرەکانیشی (شەو بوایە یان ڕۆژ) لەکاتی دیاریکراوو ڕێکخراوی خۆیدا دەکرد، ئەو سەردانەشی زیاتر لەدوای نوێژی بەیانی و نوێژی عەسر دەکرد، هەموو ئەم نموونانە لەژیانی ڕۆژانەی پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ وردی و پێشەنگی ئەومان لە هەڵسوکەوتی بەرنامە بۆ داڕێژراوی ئەودا نیشان دەدات، بۆ سەرکەوتن جگە لەمە هەڵبژاردنێکی تر نیە..

# پێغەمبەرمان ﷺ ئادابی خواردن و سەر سفرەی لەبەرچاو دەگرت

**ناوەڕۆکی پەروەردەیی**

" ڕۆڵە، بسم الله بکەو بەدەستی ڕاستت و هەمیشە لەبەردەمی خۆتەوە بخۆ".

**پێغەمبەرمان موحەممەد ﷺ**

یەکێك لە گرنگترین ئەو ئادابانەی کە پێویستە فێری منداڵ بکرێت بریتییە لە (ئادابی نان خواردن و سەر خوان)، ئەمەش بایەخی شێوازی نان خواردنەکەو کاتەکەی و دانانی ڕێز بۆ ئەو خوانە لەو منداڵە دەگەیەنێت. فێرکردنی سوپاسگوزاری لەسەر خواردن و هەستیاری نیشاندان بەرامبەری لەلایەن منداڵەوە، بە ئەندازەی چۆنیەتی نان خواردن و ئادابەکانی سەرخوان گرنگ و پڕ بایەخن، بۆیە پێویستە خێزانەکان لەلایەك شێوازو ئەتەکێتی چۆنێتی نان خواردنی فێر بکەن و، لەلایەکی تریشەوە گرنگی نرخاندنی نیعمەتەکان و سوپاسگوزاری بەرامبەر خواردنەکان لە منداڵەکانیان بگەیەنن.

پێغەمبەری خوا ﷺ بایەخی تایبەتی بە (ئادابەکانی خواردن و سەر سفرە) داوە، ئەمەشی هەم لەڕووی گەشەکردنی تەندروستی منداڵەکەو هەم لەڕووی شکورانەبژێری لەسەر نیعمەتەکان نرخاندووە.

وەکو هەمیشە گرنگە بۆ دروست کردنی خوویەکی جوان لەسەر شێوازی خواردن و دانیشتن لەسەر سفرە لەمنداڵدا، سەرەتا پێویستە خێزانەکە خاوەنی ئەو خووە جوانە بن، هەربۆیە پێویستە کۆبونەوەی ئەندامەکانی خێزان لەدەوری یەك لانی کەم ئەوانەی لەوکاتەدا لەماڵن، لەسەر یەك خوان و سوپاسگوزارییان لەسەر ئەو خواردنە، کەشێکی ئەوەندە جوان دروست بکات کە منداڵەکەش حەزی پێ بکات و لەسەری ڕابێت.

منداڵ پێویستە لە تەمەنی دوو ساڵیەوە ئیتر جێگەیەکی لەسەر سفرە هەبێت، سێ ژەمی بەردەوام و دوو ژەمیش لە نێوانەکاندا بۆ گەشەی تەواوەتی گونجاو و تەندروستە، هەروەها لەو تەمەنەوە گرنگە ئیتر بەدەستی خۆی بخوات و ئەو تواناو پشت بەخۆبەستنەی تیادا دروست بکرێت.

لەم بارودۆخەدا منداڵ لەدەوروبەری خۆی دەڕوانێت، بۆیە ئێوە چی بکەن ئەویش هەمان شت دەکاتەوە. ئێوە ئاو بخۆنەوە، ئەویش دەیخواتەوە، ئێوە واز لەخواردنی هەندێك لە سەوزەکان بهێنن ئەویش بەهەمان شێوەی ئێوە فێری هەڵبژاردن دەبێت، بۆ بەدەستهێنانی خوویەکی جوان لە منداڵەکدا، گرنگە دایك و باوکیش ئەو خووە جوانە لەبەرچاو بگرن. لە ژیانی ڕۆژانەماندا زۆرجار (منداڵی کەم خۆر) مان بەرچاو دەکەوێت، لەپاش پرسیارکردن دەبینین زۆرێك لەو منداڵە کەم خۆرانە لەژێر کاریگەری (خێزانێکی کەم خۆر) دان. ئەگەر منداڵ وەکو پێویست گرنگی و خۆشەویستی لەدایك و باوکیەوە نەبینێت، ئەوا بۆ

ڕاکێشانی سەرنجی ئەوان بەلای خۆیدا ڕێگەی تر دەگرێتە بەر، بۆ نموونە: خواردن ناخوات، بەمەش خێزانەکە گرنگی بەخواردنی دەدەن و لەو ڕووەوە لێی دەچنە پێش ، ئەوکاتە منداڵیش لەم ڕێچکەیەوە بەدەستهێنانی بایەخپێدانی ئەوان بەپێویست دەزانێت، تەنانەت منداڵ ئەگەر خۆشەویستی پێویست لەناو خێزان و قوتابخانەدا بەدی نەکات ، ئەوکات ڕەنگە فێر ببێت دژی خواستەکانی خێزان و مامۆستاکانی بوەستێتەوە.

"پێویستە دانیشتنی خێزانێك بە کۆمەڵ لەدەوری یەك و لەسەر یەك خوان لەجێی (مێزی لێپرسینەوەو ڕەخنەگرتن) بکرێتە شوێنی (پیاهەڵدان و قسەی خۆش)". بێگومان وەك ئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ پێی هەستاوە، پێویستە منداڵ ڕابهێنرێت لەسەر پاککردنەوەی دەم و دەستی پێش و پاش نان خواردن، فەرمایشتەکانی پێغەمبەرمان ﷺ لەبارەی (ئادابی خواردن و سەرسفرە)ەوە بڕبڕەی پشتی پەروەردەو پێگەیاندنی ئەم ڕۆژگارەمان پێکدەهێنێت.

ئەنەس ﷺ دەفەرمووێت: "پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر سفرە نانی دەخواردو باسی لەزیانەکانی نان خواردن بە پێوەو بە ڕۆیشتنەوە بۆ دەکردین".

ئەو فەرموودانەی پێغەمبەرمان ﷺ لەبارەی زیادەڕەوی کردن لە خواردندا چارەسەرێکن بۆ ئەو زیادەڕەویە بێ شومارەی ئەم سەردەمەی ئێمە:

" هەرکەس لەقاپێکدا بخوات و لەپاش تەواوبوون قاپەکەی پاکبکاتەوە، ئەو قاپە داوای لێخۆشبوونی لەخوا بۆ دەکات"، پەیامی ئەم فەرموودەیە چەندە هەستیارە... ئەوەندەی کە بۆتان دەخورێت خواردن ئامادە بکەن، ئەوەی کە ئامادەتان کردووە تەواوی بکەن و بەڕشتنی

زیادەڕەوی مەکەن، ئەو ڕێژەیەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ شێوازی خواردن دیاری کردووە، بنەمای گەشەیەکی تەندروست نیشان دەدات:

" گەدەتان بکەن بە سێ بەشەوە: بەشێك بۆ خواردن ، بەشێك بۆ ئاو و بەشێکیش بۆ هەناسە دابنێن".

ئەبو هورەیرە لەبارەی نانخواردنی پێغەمبەری خواوە ﷺ بەم شێوەیە دەدوێت: "پێغەمبەری خوا ﷺ هەرگیز کەموکورتی لە خواردن نەدەدۆزیەوە، ئەگەر پێی خۆش بوایە دەیخواردو پێی خۆش نەبوایە وازی لێ دەهێنا."

ئەم یادەوەریەی ئیبن عومەریش ﷺ لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ لەبارەی ئادابی سەر سفرە و میوانداریەوە، جوانترین ڕەوشتە: "ئەوانەی لەدەوری یەك لەسەر خوانێك کۆدەبنەوە، با تاکو کاتی لابردنی سفرەکە هەڵنەسن، چونکە ڕەنگە کەسانێك لەناویاندا لەبەر شەرم کردن بەرلەوەی تێر بخۆن هەستن."

ژیانی پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ وەکو هەر ڕەوشتێکی سەرسوڕهێنەری تری لە بابەتی (ئادابی خواردن و سەر سفرە)شەوە پڕ لە نموونەی ناوازەو پڕپەندە، خێزانەکان لەم ڕووەوە زۆر پێویستیان بەوەرگرتنی وانە هەیە لەسەروەرەوە ﷺ

## نموونەیەکی پەندئامێز

## چۆن خواردن دەخورێت؟

زڕکوڕی پێغەمبەری خوا ﷺ، عومەری کوڕی ئەبو سەلەمە ﷺ دەگێڕێتەوە:

من لەبەردەمی پێغەمبەری خوا ﷺ دا بووم، کە خواردنم دەخوارد دەستم بەهەموو لایەکی قاپەکەدا دەگێڕا، پێغەمبەر ﷺ پێی فەرمووم: ڕۆڵە ناوی خوا بهێنەو، بەدەستی ڕاستت بخۆو، لەبەردەمی خۆتەوە بخۆ.

لەدوای ئەو ڕۆژە بەو شێوەیەی ئەو فەرمووی، دەخوارد.[١]

١- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٥٠٦٦

# پێغەمبەرمانﷺ لە پەروەردەکردنی منداڵدا ئەرکی تایبەتی دەخستە سەر شانی دایکان و باوکان

**ناوەڕۆکی پەروەردەیی**

"بەهەشت لەژێر پێی دایکاندایە"

**پێغەمبەرمان موحەممەد ﷺ**

پێغەمبەری خوا ﷺ لە باسی پەروەردەکردنی منداڵدا ، پەیامی زۆر ورد و ژیرانەی گەیاندووە، بۆیە لەکاتی پەیڕەویکردنی ئەرکی دایکایەتی و باوکایەتیدا، لەسەر ئەوە وەستاوە کە دەبێت (خۆشەویستی و بایەخ و ئەدەبی تایبەت) لەبەرامبەریاندا بنوێنرێت، چونکە ئازیزمانﷺ زۆرباش دەیزانی بۆ پەروەردەکردنێکی شیاوی منداڵان پێویستە لەپێشدا دایکان و باوکان پەروەردەکراوێکی باش بن.

پێغەمبەرمان ﷺ لە پەروەردەی منداڵدا، دایکایەتی و خۆشەویستی دایکی لەپێشەنگی پلاندا داناوە، ئەو ئافرەتەی کە لە سەردەمی ئەودا بە مرۆڤی پلە دوو تەماشاکراوە، پێغەمبەری خوا ﷺ نرخاندویەتی و ئەو بایەخ و گرنگییەی پێغەمبەر ﷺ کردویەتی بە ئەرکی سەرشانمان تا ئێستاش پێی نەدراوە. پلەی "بەهەشت لەژێر پێی دایکاندایە" ستایش و نرخاندنێکی زۆر ناوازەیە..

سەرنجڕاکێشترین دیمەن لە گرنگیدانی پێغەمبەرمان ﷺ بە پێگەو مافەکانی ئافرەت، لەو ئافرەتانەی مەدینەوە تێدەگەین کە لەلایەن هاوسەرەکانیانەوە لێیان دراوەو سکاڵایان بردۆتە ماڵی پێغەمبەری خۆشەویستﷺ.

ئەو ئافرەتە مەدینەییانەی کە ستەمیان لە هاوسەرەکانیانەوە دەبینی، هانایان دەبردە لای میهرەبانی و بەزەیی فراوانی پێغەمبەرﷺ و لەماوەی نێوان مەغریب و کاتی خەوتندا دەچوونە لای و سکاڵای هاوسەرەکانیان لە لای دەکرد.

ئیمامی عومەرﷺ کە ئەو کردەوەیەی ئەوانی بینی، هاتە لای پێغەمبەرﷺ ئەو سەردان و سکاڵاکردنەی ئەوانی لەلای پێغەمبەری خوا ﷺ بە بێڕێزی بینی بوو، بۆیە بە پێغەمبەری ﷺ وتبوو:

"ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمان بدە بە هاوسەرەکانیان لەسەر ئەم کارەیان لێیان بدەن". پێغەمبەری خوا ﷺ بەیانی داهاتوو لەبەردەمی هاوەڵاندا ئەم وتە مێژووییەی فەرموو بوو:

"باشترینتان ئەوەیە کە لەگەڵ هاوسەرەکەیدا بەباشی هەڵسوکەوت دەکات".[1] پێغەمبەرمان ﷺ سەرەڕای بارودۆخی ئەو ڕۆژگارەی خۆیشی، بەڵام ڕێزێکی وەهای لە ئافرەت نابوو و کردبوویە بنەمایەکی گرنگ، کە تا ئەمڕۆش ئەو ڕێزو شکۆیە لە ئافرەت نەنراوە، هەروەها ئەوەی کە پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ لە (وتاری ماڵئاواییدا) لەبارەی ئافرەتانەوە فەرموویەتی، بەڕاستی شۆڕش بەرپا دەکات لە باسی (مافەکانی ئافرەتاندا).

---

١- سنن ابن ماجه، رقم الحديث: ١٩٧٤

" ئـەی خەڵكینـە ! مـافی ئافرەتـان لەبەرچـاوبگرن، لەمەشـدا لـەخوا بترسن، ئافرەتەكانتان ئەمانەتی خوان لەلای ئێوە، بـەناوی خـواوە ئـەوان بكەنە حەڵاڵی خۆتان، وەك چۆن ئێـوە مافتـان بەسـەر ئافرەتەكانتانـەوە هەیـە، ئـەوانیش لای ئێـوە حـەق و مافیـان هەیـە، حـەقی ئێـوە لای خێزانەكانتان ئەوەیە كە شەرەف و نهێنـی خێزانیتـان نەبەنـە لای كەسـێك كە ئێوە ناتانەوێت، ئەگەر ئەوان كەسێكیان هێنایە نـاو ماڵەكانتانـەوە كـە ئێوە ڕازیتان لەسەر نەبوو، دەتـوانن ڕێگرییـان لێبكـەن، بـا ئـەوان حـەقی ئێـوە بـدەن، ئێـوەش بەنـەرم و نیـانی و هەسـتیاری مامەڵـەیان لەگەڵـدا بكـەن! ئـافرەت بـەبێ ڕێگەپێـدانی هاوسـەرەكەی حـەڵاڵ نییـە شـت لەماڵەكەی ببەخشێت."

گرنگترین هۆكـاری بایەخپێـدانی پێغەمبـەر ﷺ بـە ئافرەتـان، لەبـەر ڕۆڵی نموونەیی و گـەورەی دایكایـەتی ئەوانـە لـە پـەروەردەو پێگەیانـدنی منداڵدا، دایك بەهۆی لێك نزیك بوونەوەو هەڵسوكەوتیەوە هێزی كاریگـەری دانـانی زۆر هەیـە لەسـەر منداڵەكـەی، بۆیـە دایكـی كامـڵ و ژیـر و خـاوەن كەسایەتی بەرز، منداڵی وەكو خۆی پێدەگەیەنێت.

دایـك چـەندە لەخێزانـداو لەلایـەن هاوسـەرەوە ڕێـزلێگیراوو خـاوەن كەسایەتی بێـت، ئەوەنـدەش كاریگـەری لەسـەر منداڵەكـەی دەبێـت، ئـەو دایكـەش كـە دەشـكێنرێت و، دەچەوسـێنرێتەوەو بـەردەوام سـوكایەتی پێدەكرێت، بێگومان ناتوانێت پەروەردەیەكی سوودبەخش بـە منداڵەكـەی بگەیەنێت، منداڵیش ڕەنگە وەك پێویست شتی لێوە فێر نەبێت.

بۆیە پێغەمبەری سەروەرمان ﷺ كە زۆر باش ئەم خاڵـە هەسـتیارەی زانیـوە، سـەرەتا دایكایـەتی گـەورە ڕاگرتـووە پاشـان ڕۆڵـی منـداڵ پەروەردەكردنێكی دروست و كاریگەری پـێ بەخشـیوە، چونكە ئافرەتـان یەكەمین و گرنگترین و كاریگەرترین مامۆستای منداڵەكانمانن.

یەکەمین دوو ساڵی تەمەنی، منداڵ بەتەواوەتی وابەستەی دایکیەتی لەم ماوەیەدا منداڵ شیری پێ دەدرێت و چاودێری دەکرێت لەلایەن یەکەمین و کاریگەرترین مامۆستایەوە کە دایکیەتی. ئەو بایەخەی کە بەوان دەدرێت، لەمنداڵەکانیشماندا ڕەنگ دەداتەوە، ئەو بایەخ پێدان و میهرەبانی و خۆشەویستییەی پێویستە لە بچووکیدا بە منداڵ بدرێت، چەندە کاریگەری ئەرێنی لەسەر گەشەی مێشکی دادەنێت، ئەوەندەش کاریگەری دەبێت لەسەر کارەکتەری لە گەورەییدا. ئەو منداڵانەی بە سۆزو میهرەبانیەوە پەروەردەو گەورە دەکرێن، دەبنە خاوەنی کەسایەتییەکی سەلامەت و کامڵ بۆ خۆیان، لەبەرئەوە پەروەردەکردنی دایك و شیاوی ئەو بۆ دایکایەتی ، لەپێناو گەشەسەندنی پەروەردەی منداڵدا زۆر گرنگە.

پێغەمبەری خوا ﷺ لەبارەی خێزان و پەروەردەی منداڵ و پارێزگاری و ئەدەب و ڕەوشتەوە، ڕۆڵی نموونەیی بەباوکانیش بەخشیوە، ئەوەتا دەفەرمووێت:

"کامڵبوون لە خواوەیە ، ئەدەبیش لە باوکەوە". پێغەمبەری خوا ﷺ بەم فەرموودەیەی بەرپرسیاریەتی گەورە دەخاتە ئەستۆی باوکان لە خووڕەوشت و کارەکتەری منداڵدا، پێویستە ئەوە بزانین کە یەکەمین و سەرەتاییترین پەروەردەی منداڵ، پەروەردەی ڕەوشت و ئەدەبە. پەروەردەکردنی منداڵ لەسەر ڕەوشتێکی بەرز، لە داهاتوودا ئەو منداڵە لە هاوڕێی خراپ و خووی ناشیرین دووردەخاتەوەو ئەو کردارە ناشیرینانە لەلای بێزراو دەکات، چونکە ئەگەر منداڵ بە دەمارگیری و کەللەڕەقی و چاوبرسێتی و ڕەفتاری نەخوازراوەوە بنێردرێتە ناو مەیدانی ژیان، ئەنجامەکەی نەخوازراو دەبێت. ئەگەر منداڵ لە خووڕەوشتی خراپ نەپارێزرێت، ئەمە مەترسیدار دەبێت و ڕەنگە لەهەر کاتێکدا خۆیی و خێزانەکەشی تووشی کێشەو ناڕەحەتی بکات، بەتایبەتیش باوکەکان

پێویستە بە خوورەوشت و ئەدەبەوە منداڵەکانیان پێبگەیەنن، پێغەمبەرمان موحەممەد ﷺ ئاسۆو دیدگامان بۆ ئەم ڕێگەیە دەکاتەوەو دەفەرمووێت: "پەروەردەکردنی منداڵ بە ڕەوشتێکی بەرزەوە، لە بەخشینی ڕۆژانەی ئەو کەسە باشترە"، هەروەها لە فەرموودەیەکی تردا کە دەفەرمووێت: " هیچ باوکێك شتێك لەڕەوشتی جوان باشتر وەکو میراتی بۆ منداڵەکانی بەجێناهێڵێت". کە دەبێتە هێمای بەدەستهێنانی بەختەوەری دنیاو ئاخیرەت، زانای ئیسلامیی هەبووە کە ئامۆژگاری منداڵەکەی کردووە بەوەی وتویەتی: "ڕۆڵەکەم ، فێربوونی بابەتێك لە ئەدەب، بەلای منەوە لەفێربوونی حەفتا بابەت لە زانستەکان باشترە". بەمجۆرە سەرنجی هەموانیان ڕاکێشاوە لە گرنگی بەدەستهێنانی ئەدەب و ڕەوشتی جوان و بەرز.

هەڵسوکەوتی باوك لەپێناو گەیاندنی جوانترین ڕەوشت و پێگەیاندنی پەروەردەیی منداڵەکەیدا، ڕێزگرتن و دەربڕینی خۆشەویستییە لەبەرامبەریدا، چونکە خۆشەویستی کرانەوەیەکە کە تا زیاتر بێت، ئەوەندەش ئەو منداڵە دەکرێتەوەو خۆی لە باوکی نزیك دەکاتەوە، ئەم چیرۆکە بەجوانی ئەوە ڕوون دەکاتەوە:

(کچێکی بچکۆلە کاتێك لەگەڵ دایکیدا دەڕۆیشتن، لەناکاو وەستا چاویلکەکەی کە بەدڵۆپەی باران تەڕ بوو بوو داگرت ئەوەی کە تەماشای دەکرد، منداڵێکی کچ بوو کە لەگەڵ باوکی بەسواری پاسکیلەوە دەڕۆیشتن، ئەو کچە بچکۆلەیەش کە لەسەر بەشی دواوەی پاسکیلەکە لەپشتی باوکیەوە دانیشتبوو، لەترسی کەوتن توند توند باوەشی بەباوکیدا کردبوو و لەسەرمادا ڕوومەتە سوورهەڵگەڕاوەکانی نابوو بەپشتی باوکیەوە، ئاوڕدانەوەی جارجارەی باوکەکە و ئەو قسانەی کە دەیکرد، کچە بچکۆلەی ناو بەناو دەخستە پێکەنین.

منداڵە کچەکەش کاتێك لەپشتیەوە هەر بۆ پاسکیلەکەی دەڕوانی، دایکی هەستی پێ کرد و وتی:

" چاوت هەر لەسەر ئەو پاسکیلەیە ، وەك ئەوەی یارییەکانی ماڵەوەت بەشت نەکات! بەڵام ئەگەر پێت جوانە باوکت لەمەشت بۆ دەکرێت". کچەکەش بەدەنگێکی ناسکی منداڵانەیەوە وتی:" خۆ من سەیری پاسکیلەکە ناکەم، سەیری کچەکە دەکەم، ئەها باوکی لەگەڵ ئەوەی بارودۆخی بەو جۆرەیە، کەچی قسە بۆ کچەکەی دەکات..

دایکەکەش وەك ئەوەی هیچ گوێی لە کچەکەی نەبووبێت، کڵاوە فەرووەکەی سەری ڕێك کردەوەو وتی: "هاوڕێکانت لەم هەوایەدا بەپێ دەڕۆن بۆ قوتابخانە، لەکاتێکدا باوکت چەند خولەك لەکاتی خۆی دەبات تاکو بە سەیارە مارسیدزەکەی تۆ بگەیەنێت". کچەکە هەر چاوی لەسەر پاسکیلەکە بوو دایکی ئەمجارە بە گاڵتەجارییەوە وتی: "ئەگەر تۆش دەتەوێت با باوکت بە پاسکیل بتگەیەنێت، چەندە لێتان یەت! "

کچەکەش بەسۆزداری و هەستی منداڵانەیەوە وەك بیەوێت فرمێسکەکانی چاوی لە دایکی بشارێتەوە وتی: "زۆر پێم خۆش بوو وابوایە ڕەنگە بەو جۆرە منیش باوەشم بەباوکمدا بکردایە")

هەموو ئەمانە ئەوپەڕی گرنگی خۆشەویستی نیشان دەدات ، کە وەکو کلیلی ئەفسوناوی دڵی منداڵ دەکاتەوە.

# نموونەیەکی پەندئامێز

## ڕۆڵی دایك لە پەروەردەی منداڵدا

زانای ئیسلامی سەردەممان بەدیعوزەمان لەباسی هەڵبژاردنی کارو کەوتنە ناو دنیای ماددەو ژیانی دنیایی منداڵەوە، لەجێی باوك، زیاتر ڕۆڵی دایك لەبەرچاودەگرێت، لەپەیامێکدا لەبارەی ئافرەتەوە، کە بێ چاوەڕوانی کردنی هیچ نرخێك بۆ ڕزگارکردنی منداڵەکەی تا دوا پلەی فیداکاری هەوڵ دەدات، بە (پاڵەوانی میهرەبانی)یان ناودەبات، لەدوای ئەم وەسف کردنەشی بەهۆی کاریگەری خراپی سەردەم و ڕۆژگارەوە، میهرەبانی مەزنی ئەو تەنها بەڕزگارکردنی ژیانی دنیای منداڵەکەی دیاری دەکات و دەڵێت:

" دایکی میهرەبان هەردەم ئامادەیە بۆ هەموو فیداکاری و خۆبەخت کردنێك، تا بەلاو گیروگرفت و تیاچوون لەمنداڵەکەی دووربخاتەوە ئەمەش بۆ ئەوەی لەدنیادا سوودی پێ بگات، ئیتر منداڵەکەی لەسەر ئەم بناغەیە پەروەردە دەکات و، هەموو سامانێکیشی لەپێناوی ئەوەدا خەرج دەکات کە کوڕەکەی ببێت بەمرۆڤێکی مەزن و فەرماندەیەکی گەورە، دەبینیت لەو پێناوەدا لەقوتابخانەی زانستە ئایینیەکان دەری دەهێنێت و بۆ ئەورووپای دەنێرێت، بێ ئەوەی بیربکاتەوە کە بەم کارەی ژیانی هەمیشەیی کوڕەکەی خستۆتە مەترسییەوە !

ئەم دایکە لەکاتێکدا هەوڵ دەدات کوڕەکەی لەبەندیخانەی دنیا ڕزگار بکات، گوێ نادات بەوەی بیخاتە بەندیخانەی هەمیشەیی دۆزەخەوە، کەواتە هەڵسوکەوتێك دەکات کە ئەوپەڕی پێچەوانەی سروشتی خۆیەتی، ئەوەتا لەجیاتی ئەوەی کوڕەکەی بەجۆرێك پێبگەیەنێت کە لەدواڕۆژدا

ببێته شەفاعەتكاری دایكی كە دەفتەری خێری بەهۆی ئەوەوە داناخرێت، كەچی وا پێی دەگەیەنێت كە لەو دنیادا سكاڵای لە دەست بكات، چونكە كوڕێك كە بەو چەشنە پەروەردە كرابێت لەودنیادا سكاڵا لەدەست دایكی دەكات و پێی دەڵێت:

(بۆچی لەدنیادا ئیمانت بەهێز نەكردم، بوویتە هۆی تیاچوونی ئەم ژیانەم!)

ئینجا لەبەرئەوەی بە پەروەردەیەكی ئیسلامی پەروەردەنەكراوە، ئەوا هەر لەم دنیادا گوێ بە شەفەقەتی ناوازەی دایكی نادات، بەڵكو كەمتەرخەمی زۆریش لەڕوویدا دەنوێنێت.[1]

---

١- بریسكەی بیست و چوارەم، دانراوی م. سەعیدی نورسی.

# پێغەمبەرمانﷺ دەیویست منداڵ فێری نوێژو دوعا بکرێت

**ناوەڕۆکی پەروەردەیی**

﴿إِنَّ الصَّلَاةَ تَنْهَى عَنِ الْفَحْشَاء وَالْمُنكَرِ﴾ العنكبوت: ٤٥

واتە: ((نوێژ ئادەمیزاد لە کاری خراپ و ناپەسەند ئەگرێتەوە.))

نوێژ و دوعا ڕۆحی ئیسلام و ئینسان پێکدەهێنن، خوای تەعالا گەردوون و ئەوەی کە تیایەتی لەخۆڕا دروست نەکردووەو هەرەمەکی دەستی لێ بەرنەداوە، هەر دروستکراوێکی خوای گەورە مەبەست و مانایەکی خۆی تێدایە، ئامانجی بەدیهێنانیش ناسین و پەیڕەوی و بەندایەتیکردنی خوای گەورەیە. جوانترین شێوازی بەندایەتیکردنیش جێبەجێکردنی پەرستشەکانە، کە ناوی پەرستشیش دەهێنرێت یەکەمین شت کە دێتە مێشکەوە، نوێژ و دوعایە.

نوێژ پلەی باڵای ئیمان و نووری دڵ و هێزی ڕۆح و میعراجی ئیماندارە. موسوڵمان لە سایەی نوێژدا بۆ خزمەتی مەعنەوی خوای گەورە بەرزدەبێتەوە ، بە پاڕانەوە لە حضوریدا، لەنزیکی مەعنەویاتیدا دەتوێتەوە. چەندە شەرەفێکی گەورەیە بۆ موسوڵمان...!

نوێـژ جـوانترین پەرستشـە کـە ڕۆح پـاك دەکاتـەوە و، دڵ ڕۆشـن دەکاتەوە و، ئیمان بەهەستە بەرزەکان ئاگادار دەکاتەوە، مرۆڤ لـە خراپـە دەگەڕێنێتەوە و دەیخاتەسەر ڕاستەڕێیەکی جوان لە خێر و بیرکردنـەوە و خاکی بوون.

نوێژ بە بیرخستنەوەی بەردەوامی خـوای گـەورە، دەبێتـە وەسیلەی جێگیربوونی هەستی بەرپرسیاریەتی لەدڵەکانـدا و، ئیمانـداران لـە هـەموو جۆرە خراپەو حەرامێك دەپارێزێت، لەبەرئەوەی نوێژ خـوات بیردەخاتـەوە ئەو مرۆڤەش کە خوای لەبیر بێت مەیلی بەرەو خراپەکاری و چاوبڕینە ماڵ و گیان و ناموسی کەس ناچێت.

پێغەمبەرمان ﷺ کە منداڵێکی دەبینی، یان دەیان هێنایە لای دوعای بۆ دەکردو پرسیاری لە نوێژکردن یان نـەکردنی دەکـرد، چـونکە زۆر بـاش زانیویـەتی ڕۆحێکـی بـێ نیـاز لـەدوعا، وەکـو وشـکەداری سـوتاو وایـە کـە سوتوەکەی بەچۆڵەوانیەکاندا بڵاودەبێتەوە، ئەو ئاگاداری ئـەوە بـووە کـە دوعـا، نزیـك بوونەوەیـە کـە کـات و شـوێن لـەنێوان خـواو بەندەکەیـدا هەڵدەگرێت.

"مرۆڤی خاوەن ئیمان تا دوعـا بکـات، زیـاتر لـەخوا نزیـك دەبێتـەوە، ئیمانی زیاد دەکات و هەستی بەندایەتی بەهێزتر دەبێـت، خـوای موتـەعال زۆر گرنگی بە دوعـاکردنی ئێمـە دەدات، لـە ئایەتێکدا کـە سـەرنجمان بـۆ بایەخی دوعاکردن ڕادەکێشێت دەفەرموێت:

﴿قُلْ مَا يَعْبَأُ بِكُمْ رَبِّي لَوْلَا دُعَاؤُكُمْ فَقَدْ كَذَّبْتُمْ فَسَوْفَ يَكُونُ لِزَامًا﴾

الفرقان: ٧٧، واتە: ((تۆ ئەی مەحەممەد! بەو کافرانە بڵـێ: خـوای مـن هـیچ بایەخێکتان ناداتێ ئەگەر لەبەر ئەوە نەبێ کە بانگتـان بکـا بـۆ بـاوەڕ بـە خواو بە پێغەمبەری خوا تا لەوەپاش بڕوبیانووتان نـەمێنێ و نـەڵێن کـەس بانگی نەکردین بۆ موسوڵمان بـوون، چونکە ئێـوە خـواو پێغەمبـەرتان بـە

درۆ لەقەڵـەم داوەو لەبـەر ئـەوە سـزای ئـەو تاوانـەتان پێـوە ئەنووسـێ و ناچاری ئەبێ و ئەو سزایەتان هەر ئەدرێ.))[1]

لـەم ئایەتــەوە تێدەگـەین کـە لـەلای خـوای گـەورە بایـەخی مـرۆڤ پەیوەستە بەڕادەی دوعاکردنیەوە.

" ئەم بارودۆخەش نزیکبوونەوەیەکی ئەرێنی و سەلامەتی کەسێتی و ڕۆحی و فراوانبوونی ئاستی تێگەیشتن لەنێوان دایك و باوك و منداڵەکانـدا دەهێنێتەو کایەوە"، لەبەرئـەوە پێویسـتە دوعـا بـۆ منداڵـەکانمان بکـەین، داخوازی خێرو چاکەیان لە خـوا بـۆ بکـەین. بـاوکی میهرەبـان، حـەزرەتی ئیبراهیم (علیه السلام) دوعای بۆ منداڵەکانی کردووە لەخوا داوای لێخـۆش بوونی بۆ کردوون.

قورئان بەم شێوەیە دوعا جوانەکەی ئەومان بۆ دەگوێزێتەوە:

"﴿رَبِّ اجْعَلْنِي مُقِيمَ الصَّلاَةِ وَمِن ذُرِّيَّتِي رَبَّنَا وَتَقَبَّلْ دُعَاء* رَبَّنَا اغْفِرْ لِي وَلِوَالِدَيَّ وَلِلْمُؤْمِنِينَ يَوْمَ يَقُومُ الْحِسَابُ﴾ إبراهيم: ٤٠ -٤١، واتـە: ((خودایـا بمکـە بـە ئینسـانێ بـەردەوام بم لەسـەر نوێـژو عیبـادەت. هـەروەها لـە نەوەیشم. خودایا دوعایشم قبووڵ بکە. خودایـا! لـەو ڕۆژەدا کـە حیسـاب بەرپا ئەبێ، تاوانی خـۆم و بـاوك و دایکـم بپۆشـە، هـی ئەوانـەیش لەسـەر دەستی منا ئیمانیان پێت هێناوە.))[2]

دوعا ناوەڕۆکی بەندایەتییە ، خێرو شەڕو هـەموو شتێك بـە تەقـدیری خوای گەورەیە، پێویستە داوای ڕەحم و بەزەیی و لێخۆشبوون و خێـر لـەو زاتــە بکــەین، بــۆ منداڵەکانیشــمان داوای کــاری خێــرو ســەرکەوتن و لێخۆشبوون و ڕزقی بەبەرەکەت و زانستی فراوان و زیهنی کراوە بکەین.

---

١- خولاصەی تەفسیری نامی، ل: ٣٦٦

٢- خولاصەی تەفسیری نامی، ل: ٢٦٠

پێغەمبەرمان ﷺ دەیفەرموو:

" دوعـــای بـــاوك بـــۆ ڕۆڵەكـــەی، وەكـــو دوعـــای پێغەمبەرانـــە بـــۆ ئوممەتەكانیان".

" سێ دوعا هەیە كە خوارەتی ناكاتەوە، هیچ گومانێك نییـە لـەوەی خوای گەورە قبوڵی دەكات، دوعای ستەملێكراو، دوعـای میـوان و دوعـای بـاوك بـۆ منداڵەكـەی"... واتـە دوعـای بـاوك بـۆ منداڵەكـەی دوعایـەكی قبوڵكراوە.

پێغەمبەرمان ﷺ كردنی دوعای شەڕی قەدەغەكردبوو، " دوعای شەڕ لەمنداڵەكانتان مەكەن، چونكە ڕەنگە لای خوا قبوڵ ببێت!".

"دوعا لە نەفسی خۆتان مەكەن، دوعا لە منداڵەكانتان مەكـەن، دوعـا لە خزمەتكارەكانتان مەكەن، دوعا لە ماڵەكەشتان مەكـەن، نـەكا بكەوێتـە ساتی قبوڵ بوونی دوعاوەو داواكەتان وەربگیرێت".[1]

ئەنەس ﷺ دەڵێت: دایكم هێنامی بۆ خزمـەتی پێغەمبـەری خـوا ﷺ نیـوەی سەرپۆشـەكەی خـۆی كردبـوو بـە شـەرواڵ بـۆم و نیوەكـەی تـری كردبوو بە كراس بۆم، وتـی: " ئـەی نێردراوی خـوا ﷺ! ئەمـە ئەنەسـی كوڕمــە بــۆم هێنــاوی خزمــەتت بكــات، لــەلای خــوا دوعــای بــۆ بكــە.."، پێغەمبــەری خــواش ﷺ بــەم شــێوەیە بــۆی پاڕایــەوە: "خودایــە! مــاڵ و نەوەی زۆركەی، لەوەش كە پێی دەبەخشیت بەرەكەتداری بكە!"

ئەنەس ﷺ دەڵێت: "وەڵاهی ماڵەكەم زۆرە، منداڵ و نـەوەكانم ئـەمڕۆ لەسەد زیاترن."[2]

أبو العلیة دەڵێت:

---

١- صحیح مسلم، رقم الحدیث: ٥٤٤١

٢- صحیح مسلم: رقم الحدیث: ١٠٩٠

" ئەنەس ﷺ ماوەی دەساڵ خزمەتی پێغەمبەری خوا ﷺ ی کردو دوعای قبوڵ کراوی ئەوی بۆ کرا، باخێکی هەبوو لەساڵێکدا دوو جار بەروبوومی دەدا. لەباخەکەیدا ڕێحانەی هەبوو، کە بۆنی میسکی بڵاودەکردەوە"

پێویستە دایك و باوك و پەروەرشیاران باوەڕیان بە هێزی دوعاکردن هەبێت، منداڵەکانیان فێری بەندایەتیکردن و دوعای خێر بکەن، ڕاهێنانی ڕۆژانەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر نوێژکردن و دوعاکردن لە منداڵاندا، پێویستە ببێتە پێشەنگی دایکان و باوکانی ئەم سەردەمە، بۆئەوەی منداڵان لە ماڵەوەو لەگەڵ گەورەکاندا لەسەر نویژکردن ڕابهێنرێن پێویستە ئاسانکارییان بۆ بکرێت و هان بدرێن، ئەمەش یارمەتیان دەدات بەشێوەیەکی ئاسانتر فێری ببن و چالاك ببن تیایدا.

پێغەمبەرمان ﷺ ئەو شێوازەی پەیڕەوی دەکرد لە (هۆکارو سەرەنجام) هەرگیز فەرامۆشی نەدەکرد، ئەو شێوازە پەروەردەییەی لەسەر منداڵێك جێبەجێی دەکرد، چاودێری دەکرد و چەند جار دووبارەی دەکردەوە لەبەرئەوە ئەم شێوازی دووبارەکردنەوەیە لە "پەروەردە" دا لایەنێکی سەرنج ڕاکێشەرە. پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ ئەوەی منداڵانی تەمەن دەساڵی لەسەر پێنج نوێژە فەرزەکە ڕادەهێنا، هەروەها بۆ نوێژی هەینی و نوێژی جەنازەو جەژنەکانیش داوای دەکرد منداڵەکانیش بچن و فێری پاڕانەوەو دوعای دەکردن. پێغەمبەری ئازیزمان ﷺ جارێك کە بەقەیسی کوڕی سەعدی کوڕی عوبەیدە دەفەرموێت:" یەکێك لەدەرگاکانی بەهەشتت پێ بڵێم؟!" جگە لە خوا خاوەن هێزو دەسەلاتێکی تر نییە!". بەم ڕستەیە ئیمان و باوەڕی منالانی بەرزدەکردەوەو فێری پشت بەستن بەخواو دوعای دەکردن.

هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ کە بەپێی ئەو ڕێیان دەکرد، منداڵەکانیان فێری ئەم دوعایانە دەکرد "خودایە، پەنا دەگرم بە تۆ لە هەژاری و تەمەڵی و زەلیلی لەپیریدا و خراپیەکانی دنیاو سزای ناو گۆڕ!"

تەکنیکی تێگەیاندنی پەرستشەکان لای منداڵان لەلایەن پێغەمبەری خواوە ﷺ نزیکبوونەوەیەکی دەروونی زۆر گونجاو بوو، بەبێ دڵ شکاندن و بەبێ زۆرکردن هانی دەدان.

عەبدوڵلای کوڕی عەباس کە تا تەمەنی سیازدە ساڵی لەلای پێغەمبەرﷺ مابوویەوە، بەم شێوەیە باس لەمامەڵەی پێغەمبەری خوا دەکات لەگەڵ منداڵان لە قۆناغی هەرزەکاریدا:

ڕۆژێك پێغەمبەر ﷺ سوار پشتی حوشترەکەی بوو بوو، منیش لەخزمەتیدا بووم، ئەمانەی پێ فەرمووم:

" عەبدوڵلا! با چەند شتێکت پێ بڵێم:

" لەکاتی خۆشیدا خوات لەبیر بێت، با ئەویش لە نارەحەتیدا لەگەڵت بێت، گرنگی بەئەمرو نەهیەکانی خوای گەورە بدە، تا ئەویش گرنگی بە تۆ بدات، حەقەکانی خوای گەورە لەبەرچاو بگرە تا ئەو هەمیشە لەلای خۆت بدۆزیتەوە."

هەرکات شتێکت ویست، لەخوای داوا بکە، ئەوە بزانە ئەگەر هەموو ئەوەی لەدنیادا هەیە بیانەوێت زیانت پێ بگەیەنن، جگە لەوەی خوا تەقدیری کردووە بۆت، ناتوانن هیچی تر بکەن."

ئەو تەمەنەی پێغەمبەری خواﷺ دیاری کردووە تا منداڵانی بۆ نوێژ لەسەر ڕابهێنرێت، حەوت ساڵانە هەرچەندە ئەو منداڵەی لەخێزانێکی دینپەروەرو نوێژخوێندا گەشەبکات بەرلەوەش ئاشنایەتی لەگەڵ نوێژو پەرستشەکان پەیدادەکات، جوانترین شێوازی پەرستش کە نوێژە سەرنجی ئەو ڕادەکێشێت، لەوکاتەدا ئەرکی سەرشانی ئەو دایك و باوکە

تەواوکردنی کەم و کورپەکانیەتی، ئەو منداڵەش کە تا ئەو تەمەنە فێری نوێژ نەبووبێت، پێویستە ئیتر ڕابهێنرێت و هەندێك لە دوعا و سورەتەکانی بەشێوازی نەرم و نیان فێربکرێت.

بەگوێرەی فەرمودە پیرۆزەکانیش کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی:

"منداڵ تا دەگاتە تەمەنی پێگەیشتن داوالێکراو (مُکلف) نییە".[١]

لەمەوە تێدەگەین کە تا دەگاتە ئەو تەمەنە، پێویستە دایك و باوك پەروەردەیەکی باشی دینی بۆ منداڵەکەیان لەبەر چاو بگرن و، لەپەرستشەکانی خۆیاندا بەشداری پێ بکەن. بۆ ئەمەش زۆر گرنگە کە شێوازێکی ناوازەو سەرنج ڕاکێش بۆ فێرکردن بەکاربهێنرێت، ڕێگەیەکی گونجاو کە لەئاستی تواناو تێگەیشتنی منداڵەکەدا بێت.

" پێویستە منداڵەکانمان فێری ئیمان و ڕەوشت و خۆشەویستی بۆ خوێندن و زانست بکەین، گرنگی کار و زانستیان تێبگەیەنین".

## نموونەیەکی پەندئامێز

## موسوڵمان، ئەگەر لەدین دوور بکەوێتەوە...

بەدڵنیاییەوە دینی ئیسلام بەتەنها فەرمان بە پەروەردەو ڕەوشت و بەندایەتیکردن نادات، بەڵکو ڕێنمایی مرۆڤایەتی دەکات بەفێربوونی زانست و کارکردن و هەوڵدانی بەردەوام لەبەر ئەم هۆیە هەرکات موسوڵمانان فەرمانەکانی ئیسلامیان وەك خۆی بەجێ گەیاندبێت، بەرزبوونەتەوەو پێشکەوتوون هەرکاتیش فەرمانەکانیان فەرامۆش کردبێت دواکەوتوون و سەریان بۆ دوژمنەکانیان شۆڕکردووە.

---

١- سنن ابو داود، رقم الحديث: ١٣٨١

پێغەمبەری ئازیزمانﷺ وەکو موعجیزە هەواڵی داوە دەربارەی ئەوکاتەی لەنزیکی ئاخیر زەماندا موسوڵمانان واز لەفەرمانە جوان و بەرزەکانی ئیسلام دەهێنن و دەکەونە بەردەستی دوژمنان و ئەهلی کیتاب.

" نزیکە نەتەوەکان بدەن بە سەرتاندا، هەروەکو چۆن خەڵکانێکی برسی دەدەن بەسەر خواردنێکدا کە بۆیان ئامادەکراوە".

پێغەمبەری خوا ﷺ موعجیزە ئاسا هەواڵ دەدات لەبارەی حاڵی وڵاتە ئیسلامیەکانەوە کە سەرقاڵ دەکرێن لەلایەن وڵاتە ئیمپریالیستەکانەوەو پاشان نەوت و ژێرخانیان بۆ خۆیان دەبەن. جا یەکێك لە هاوەڵان پرسی:

" ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو ڕۆژە بەهۆی کەمی موسوڵمانانەوەیە کە وامان بەسەر دێت؟!"

"نەخێر، بەڵکو ئێوە لەو ڕۆژەدا زۆرن، بەڵام وەك گەڵایەکی زۆری وەریون کە لەسەر ئاوێك وەستابن کە لەبەر زۆرییان و کەمی سەنگیان کەوتون بەسەر یەکداو کۆبوونەتەوە. سوێند بەخوا، خوای پەروەردگار ئەو ترس و سامەی ئێوە کە لەدڵی دوژمنەکانتاندا هەتانبوو دەری دەهێنێت و لەجیاتیدا لاوازی و بێدەسەڵاتی دەخاتە شوێنی.

جا کابراکە دووبارە وتیەوە: ئەی پێغەمبەری خوا (وَهَن چییە؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: خۆشویستنی دونیاو ترسانە لە مردن."[1]

---

١- الذهد ابی داود، رقم الحدیث: ٣٦٤

# پێغەمبەرمانﷺ شەڕکردنی لەبەرچاوی منداڵاندا قەدەغەکردبوو

**ناوەڕۆکی پەروەردەیی**

" باشترینتان ئەوەیە کە بۆ ماڵ و منداڵی باشە".

**پێغەمبەرمان موحەممەد ﷺ**

لە پەروەردەی منداڵاندا ، نێوەندی خێزان بەگوڵدان و منداڵیش بەگوڵ دەچوێنرێت، ئاودان و چاودێری گوڵەکەش خۆشەویستی و گرنگی پێدانی دایـك و باوکـە بـۆ منداڵەکـەیان. منـداڵ چـەندە خـۆش بویسـترێت و نەشـکێنرێت و نـەڕەنجێنرێت، ئەوەنـدە لـەڕووی ئـەقڵی و کەسـایەتییەوە گەشە دەکات، ئەگەر لە نـاو خێزانێکی پڕکێشـەو ئـاژاوەدا گـەورە ببێـت، وەکو گـوڵی بـێ ئـاو دەمێنێتـەوە، کـە سیس دەبێـت و سـەری دەباتـەوە ناوخۆی و کێشە دەروونیەکانی دەست پێ دەکات.

ئەنەس ﷺ کە لـەژێر چـاودێری پێغەمبـەری خـوادا گـەورەبوو ڕۆژێـك ئازاری حەسەنﷺ ی دابوو کە لەخۆی بچووکتر بـوو، پێغەمبـەری خـواﷺ فەرمووبووی:

" ئەی ئەنەس! واز لەکوڕەکەم کە میـوەی دڵمـە بهێنـە، ئـەوەی ئـەو بڕەنجێنێـت منـی ڕەنجانـدووە کەسـێکیش مـن بڕەنجێنیـت خـوای

ڕەنجاندووە". ئەو هەستیاری ڕەتکردنەوەیەی پێغەمبەری ئازیزمان ﷺ لەبەرامبەر ئازاردانی منداڵدا نیشانی داوە، بێگومان تەنها بۆ نەوەکانی خۆی نەبووە، ئەو کە پێغەمبەری خۆشەویستی و میهرەبانی و ڕەحمەتە، بەم هەڵوێستەی پێوەری پێویست بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ هەموو منداڵێکدا دەخاتە پێش چاو، دیارە ئەمەش بەتەنها ڕەتکردنەوەیەك نییە لەلایەن پێغەمبەری خواوە، بەڵکو ئەمە ئاگادارکردنەوەیەکی توندە و بەمانای ئەوە دێت کە "ئەگەر منداڵان بڕەنجێنن و بیان شکێننەوە خواتان ڕەنجاندووە".

با دایك و باوك ئەوە باش بزانن، ئەگەر لەخێزاندا تەنها یەکێك ناڕەحەت بێت، هەموو ئەوانی تریش دڵتەنگن. بێتاقەتی ڕێگە بۆ نەخۆشی ڕۆحی تریش دەکاتەوە، تەنانەت ئەگەر لەئاستی خۆی زیاتر تێپەڕێت، نەخۆشی جەستەییشی لێ دەکەوێتەوە. ئەو نەخۆشیەش کە لە خەم و خەفەتەوە بێت یان درێژخایەن و بەردەوام دەبێت یان مرێنەرە.

ڕەنگە منداڵ هەندێك جار (کاری خراپ) بکات، بۆ نموونە لە خوشك و براکەی بدات، ئازاری ئاژەڵێك بدات، شتێك بشکێنێت... بێ فەرمانی بکات...هتد

ئەمانە نابنە هۆکار بۆ ئەوەی ئەو منداڵە ئازار بدرێت، چونکە ناکرێت بە شکاندن و توندوتیژی نواندن ئەو منداڵە لە خووڕەوشتێکی خراپ دووربخرێتەوە، بەڵکو بەڕێگەو شێوازی جۆربەجۆری تر دەکرێت، چونکە ئازاردان هەم توندوتیژی و ستەمە، هەم لای منداڵەکە مانای نییەو تێناگات، بەڵکو پێویستە بۆ پەروەردەی منداڵان لێپرسینەوە و هەستکردن بە بەرپرسیاریەتی و پەیڕەوکردنی یاسای سزاو بەخشش بەکاربهێنرێت... کە لەئەنجامدا دەبنە هۆی بەدەستهێنانی هەڵسوکەوتی جوانی منداڵەکە بەشێوازێکی گونجاو و دادپەروەرانە.

" یاسای دروست ئەوەیە بەخۆشەویستی بەخشین و گرنگییەکی بێ مەرج و بێ بەرامبەرەوە، لەناوەندی متمانەدا و بەمیهرەبانیەوە تەماشای ئەنجامی کارەکانی منداڵەکە بکرێت، ئامانج ئەوەیە "منداڵەکە دوور لەچاوی گەورەکانیش و ئەگەر لای ئەوانیش نەبێت" خاوەنی هەڵسوکەوتی جوانی خۆی بێت و بتوانێت لەسەر پێی خۆی ڕاوەستێت، ئەمەش بەبێ ئازاردان و توندوتیژی لەگەڵ منداڵەکەدا، بەدەست دێت".

گرنگترین خاسیەت کە دایك و باوك زۆریاش سەرنجی بدەن ئەوەیە:

ئەو دایك و باوکانەی دەیانەوێت بەسزادانی توندو شکاندن، منداڵەکەیان لەڕەوشتێکی هەڵە بگێڕنەوە، ئەو منداڵە زیاتر وابەستەی ئەو کارە هەڵەیە دەکەن، هەروەك چۆن منداڵ فێری ئەو خووڕەوشتە باشانە دەکرێت کە لەسەری ستایش دەکرێت، هەربەوجۆرەش فێری ئەو خووڕەوشتە خراپانە دەبێت کە بەهۆیانەوە سزا دەدرێن.

لەژیانی مامۆستایەتی خۆمدا، تێگەیشتم ئەو منداڵانەی لاسارو شەڕەنگێزو گوێ نەدەر بوون، کە لە خێزانەکانیان دەکۆڵدرایەوە لە خانەوادەیەکی شەڕانی و توندوتیژەوە هاتوون، هەستم بەوە کرد کە کەش و هەوای ناو ماڵ و خێزان ، چەندە کاریگەری لەسەر لایەنی دەروونی و ڕۆحی منداڵ بەجێ دەهێڵێت..

لەبەرئەوە چەندە قسە پێ وتن و شکاندنەوەو توندوتیژی لەگەڵ منداڵدا کارێکی هەڵەبێت، ئەنجامدانی ئەم کارەش لەبەرچاوی منداڵدا هەر بەو ڕادەیە هەڵەیە، دایك و باوك هەرگیز نابێت دەمەقاڵەو شەڕەکانیان لەلای منداڵەکانیان بکەن، چونکە مرۆڤ کاتێك تووڕەو ناڕەحەتە ئەوەی لەدەمی دێتە دەرەوە، گوێی نابیستێت و، بەسەر تووڕەییەکەیدا زاڵ نابێت و ڕەنگە وشەی نەشیاو بەکاربهێنێت، ئەو منداڵەش کە ئەمە دەبینێت وەریدەگرێت و هەرکات بیەوێت بەکاریدەهێنێت، بەمجۆرە منداڵی

شەڕەنگێز ئەم وشە و قسانە لەدایك و باوكیەوە فێر دەبێت، ئەمەش خراپترین بێڕەحمییە كە بەرامبەر منداڵ بكرێت. بۆئەوەی منداڵ بەشێوەیەكی تەندروست گەشەبكات، زۆر گرنگە كە دایك و باوك لەلای منداڵەكانیان زۆرترین خۆشەویستی بەرامبەر بەیەك و بەرامبەر بەمنداڵەكانیان دەربڕن.

پێغەمبەرمان ﷺ بەدرێژایی هەموو ژیانی نە وشەیەكی نەشیاوی بەهیچ كەسێك وتووە، نەدەستی لەكەسێك بەرزكردۆتەوە، لەبەرئەوەیە كە ئەم ڕێنماییە بە ئوممەتەكەی دەدات:

" باشترینتان ئەوەیە كە لەگەڵ ماڵ و منداڵەكەیدا باشە، من باشترینم بۆ ماڵ و منداڵم".[1]

" لەنێوان ئیمانداراندا كامڵترینیان لە ئیماندا، ئەوەیە كە ڕەوشتی جوان بێت و، باشترینتان بێ بۆ ماڵ و منداڵەكەی".[2]

پێویستە دایك و باوك ئەو ڕاستییە زۆر باش بزانن كە ئەوان چۆن ڕەفتار بكەن، منداڵەكان كۆپی ئەوان دەردەچن، لەبەرئەوە پێویستە گەورەكان لەخێزاندا بەم جۆرە بیربكەنەوە: (من بمەوێت چۆن منداڵەكەم پەروەردە بكەم، دەبێت سەرەتا خۆم بەو جۆرە بم و ببمە نموونە بۆ منداڵەكەم).

با دایك و باوك ئەوە لەبیر نەكەن:

- ئەگەر منداڵێك هەمیشە ڕەخنەی لێبگیرێت، بێ دەنگ و گۆشەگیر دەبێت.

---

١- سنن ابن ماجه: رقم الحديث: ١٩٧٣

٢- سنن الترمذي، رقم الحديث: ٢٦٠٠

- ئەگەر منداڵێك لەنێوەندێكی توندوتیژیدا گەورە ببێت، شەڕانی دەردەچێت.
- ئەگەر منداڵێك بە گاڵتەپێكردن بچووك بكرێتەوە، شەرمن و بێ ڕوو دەردەچێت.
- ئەگەر منداڵێك بەهەستی شەرمەوە گەورە ببێت، فێری تاوانبارکردنی خودی خۆی دەبێت.
- ئەگەر منداڵ بەنەرمییەوە پەروەردەكرا، فێری ئارامگری دەبێت.
- ئەگەر منداڵێك بەرپرسیاریەتی پێی بدرێت متمانەبەخۆبوونی تیا دروست دەبێت.
- ئەگەر منداڵێك خەڵات بكرێ و ستایش بكرێت، فێری سوپاسگوزاری دەبێت
- ئەگەر منداڵێك ڕێزی لێ بگیرێت، بەباوەڕەوە گەورە دەبێت.
- ئەگەر منداڵێك قەناعەت و پەسەندكردنی ببینیبێت، لەدنیادا فێری بەختەوەری دەبێت.

كەوایە پێویستە دایكان و باوكان واز لە ڕەفتاری توندو هەڵسوكەوتی نەشیاو بهێنن و بە نەرمونیانی و خۆشەویستی خۆیشیان ببنە نموونەی باش بۆیان و بەشێوەیەكی دروست پەروەردەیان بكەن.

## نموونەیەکی پەندئامێز

## تابلۆیەکی ناوازەی پەروەردەکردن

دیمەنێکی سەرسوڕهێنەر لەژیانی ئەو کەسەی بە ڕەوشتە نموونەییەکانی چۆتە ناو چەندەها دڵ و یەك بە یەکی هەڵەکانیانی ڕاست کردۆتەوە. ڕۆژێك پێغەمبەرمان ﷺ دە پارچە زیوی خستە گیرفانی و چووە بازاڕی مەدینە، بە چوار زیو کراسێکی کڕی و، لە پاشان هەژارێکی بینی کراسەکەی پێ دابوو، بەچوار زیوی تر کراسێکی دیکەی کڕی و، کاتێك لەڕێگا دەڕۆیشت، کچێکی بچووکی دی کە خەریکە دەگری، کچە بچووکەکە خزمەتکار بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ لەهۆکاری گریانەکەی پرسی، ئەویش وتی: "خاوەن ماڵەکەم بۆ کڕینی ئارد دوو زیوی پێدا بووم، بەڵام ونم کردووە"

پێغەمبەریش ﷺ ئەو دوو زیوە کە لەگیرفانیدا مابوو، دەریهێنا و فەرمووی:

" مەگری کچم، ها بەمە ئارد بکڕە ! "

بەڵام کچە خزمەتکارەکە کێشەیەکی تریشی هەبوو، وتی:

" دەترسم لەبەر درەنگ گەڕانەوەم بۆ ماڵەوە، لێم بدەن. "

پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی کچە بچووکەکەی گرت و چوون بۆ ئەو ماڵەی خزمەتی تێدا دەکرد، ماڵەکە کە پێغەمبەری خوایان ﷺ بینی، زۆر سەرسام بوون، چونکە ئەو سەرداری جیهانیانە.

بە ماڵەکەی فەرموو:

"لەبەرئەوەی درەنگ کەوتووە لە سزادان ترساوە، بەهیچ شێوەیەك لێی نەدەن ! "

خـاوەن ماڵەكـەش لەبـەر ئـەو میوانداریـە شـەرەفمەندانەیەی ئـەو، یەكسەر لەوێدا بڕیاری داو وتـی:

" ئـەی پێغەمبـەری خـوا ! مـادام مـاڵی ئێمـەتان بەمیوانـداری شەرەفمەند كرد، ئێمەش ئەو كچە ئازاد دەكەین ئیتر ئەو ئازادە".

پێغەمبەری خوا لەوێدا فەرمووی:

" خودایە! ئەو دە پارچە زیوە چەندە بەبەرەكەت بوو، بـەوە منـیش و نەدارێكیش پۆشتە كرا و دڵی كچێكی منـداڵت پـێ خـۆش كـردو ئـازادت كرد، بەهێندەی ژمارەی بوونەوەران سوپاس بۆ تۆ".

پێغەمبـەرمانﷺ بـەم نـەرم و نیانیـەی بەهـەموو مرۆڤایـەتی نیشـان دەدات كـە لـە پەیوەنـدی نێـوان كەسـەكاندا و لـە پـەروەردەی منداڵـدا، میهرەبانی و خۆشەویستی و بایەخپێدان ئەفسوناویترین كلیلن..

ئەمـە تابلۆیـەكی پەروەردەییـە، دیمـەنێكی ئەوەنـدە ناوازەیـە كـە بەدرێژایی سەردەمەكان ون نابێت و بیرناچێتەوە.

# پێغەمبەرمانﷺ پەروەردەیەکی ڕەسەنی بەمنداڵان دەدا

**ناوەڕۆکی پەروەردەیی**

**" منداڵەکانتان لەسەر سێ خەسڵەت گەورە بکەن؛**

**خۆشەویستی پێغەمبەر، خۆشەویستی ئەهلی بەیت و**

**تیلاوەی قورئان. "**

**پێغەمبەرمان موحەممەد ﷺ**

پێغەمبەری خوا ﷺ پێویستی پەروەردەکردنی منداڵانی لەسەر بنەمای خۆشویستنی خواو پێغەمبەرو پەیڕەویکردنی قورئان، بە وتە و کردارەکانی نیشان داوە، ئاماژەی بەوە کردووە هەر منداڵێك لەم سێ شتە مەحروم بکرێت زیان بەخۆی و کۆمەڵگەش دەگەیەنێت.

پێغەمبەری خواﷺ، چۆنیەتی پەروەردەو مامەڵەکردنی لەگەڵ منداڵدا بەهەموو وردەکاریەکانیەوە بۆ ڕوون کردوینەتەوە هەر لەساتی لەدایك بونیەوە تا کاتی گەورەبوونی. منداڵ لەدوای لەدایك بوون بە بەرگی سپی بپۆشرێت و بەخورمایەکی باش مەلاشووی شیرین بکرێت و ناوی باشی لێ بنرێت، نەریتی پێغەمبەری خوا بووە.

هەروەها بە زمانی جەستە دەربڕینی خۆشەویستی و میهرەبانی بۆ منداڵ و لەئامێز گرتنی تا تەمەنی دەگاتە ئەوەی قسە بکات و لەقسە تێ بگات، دیسان لەو ڕەوشتانەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ ویستویەتی.

پێغەمبەری خوا ﷺ دەیویست ئەوەندەی کە پێویستە شیر بەمنداڵ بدرێت ئەمڕۆش شتێك لەشیری دایك باشتر بۆ منداڵ نەسەلمێنراوە، لەبەر گرنگی شیر بۆ منداڵ فەرموویەتی:

" لەپاداشتی هەر جارێکدا کە ئافرەتێك شیر بە منداڵەکەی دەدات، خوای گەورە خێری ئازاد کردنی کۆیلەیەکی بۆ دەنووسێت، هەرکاتێ شیردانی منداڵەکەش بەرەو کۆتایی دەچێت و منداڵ لەشیر دەگیرێتەوە، فریشتەی خوای گەورە دەست دەخاتە سەر سکی و دەڵێت: لەسەرەتاوە دەست بەژیان بکەرەوە، چونکە خوا لە گوناهەکانی ڕابردووت خۆش بوو".

کە تەمەنی منداڵیش دەگەیشتە ئەوەی قسە بکات و تێ بگات و هەست بەدەوروبەری بکات، بۆ ڕاهێنانی لەگەڵ نوێژو پەرستشەکاندا دەیویست ببرێنە مزگەوت و ئەو کەشە ببینن، بەم شێوەیە منداڵ لەیەکەم هەنگاودا بناغەی پەروەردەی لەناو مزگەوت و جەماعەتدا، لەگرنگی و خۆشەویستی ئەواندا وەرگرت، یەکەمین پەروەردەی بنچینەیی پێغەمبەری خوا ﷺ فێری منداڵەکانی دەکرد، تێگەیاندنی دوعاو نوێژەکان بوو، لەبەر ئەوە بەبێ گوێ دانە هەڵە و کەم و کورتیەکانیان بۆ هەر دوعاو نوێژ ئەنجام دانێك ستایشی دەکردن.

گرنگترین پەروەردەی بنەڕەتیش لەلای هەست کردن بە خۆشەویستی خواو پێغەمبەرو قورئان بوو، ئەمەش دەبێت بە خۆشەویستی بەخشین بە منداڵەکە تێبگەیەنرێت. بۆ مانەوەی ئەو خۆشەویستییەش لە دڵی منداڵەکەدا، بەدرێژایی ژیانی نەرم ونیانی و ئارامگری پێویست بوو.

سەرەتاییترین پەروەردەی پێغەمبەر ﷺ بۆ منداڵان ئەمە بوو.

پێغەمبەرمان ﷺ بۆ هەموو مرۆڤایەتی بەڕەحمەت نێردراوە بەهۆی ئەم تایبەتمەندیەشەوە هەست بەهەموو ئازارو ناڕەحەتیەکانی مرۆڤەکان دەکات، چونکە ئەو ئوممەتەکەی خۆی زۆر خۆشدەویست، لەبەرئەوە خۆشەویستی ئێمەش بۆ ئەو پێویستە بگاتە کامڵبوونی تەواوەتی، چونکە ئەو خۆشەویستییە عەشقی ئیلاهیشمان لەلا زیاد دەکات، خۆشەویستی خواش ئیماندارە ڕاستەقینەو ڕاستگۆکان هەستی پێ دەکەن و بەچێژەکەی ئیمانیان پتەو دەبێت، پێغەمبەری خوا ئەو چێژە مەعنەویەی ئەو کەسانەی باس دەکرد و بەرزبونەوەی ئیمانیانی دەخستەڕوو.

خۆشەویستی خوا بناغەی ڕەوشت و سەلارییە، ئەو بەندەیەی لەناو خۆشەویستی خوادا ڕۆچووە، نوورانی و پاك و نەرم و نیان و هەست بەرزو زمان شیرین و کردەوە جوان دەردەچێت و، خراپە و، دوژمنایەتی و، قین و ڕق و، نیەتی بەد لەدڵیدا جێگەی نابێتەوە.

هەموو بوونەوەرو مرۆڤایەتیش خۆشەویستی ئەو بەدیهێنەرە مەزن و کارسازە لە دروستکراوەکانییەوە دەبینن. ئەو خۆشەویستیەی کە دەبێتە هۆی کرانەوەی نەفسی خاوەنەکەی، هەموو هەڵە و گوناه و کەم و کورتیەك دەتوێنێتەوە، ئەو کاتە ژیان بە خۆشەویستییەوە دەپارێزرێتەوەو بەکردەوەی جوانەوە دەبرێتە سەر.

بەبێ خۆشەویستی پێغەمبەریش ﷺ مرۆۆ ناتوانێت بەخۆشەویستی خوا بگات، خوای گەورەش گەیشتن بەخۆشەویستی خۆیی پەیوەست کردووە بەخۆشەویستی پێغەمبەرەکەیەوە، بەهێزترین ئیماندار ئەوەیە کە بەباشترین شێوە چاو لە پێغەمبەر دەکات. ڕێگەی خۆشویستنی خوای موتەعال بە پەیڕەویکردنی ڕێبازی پێغەمبەرەکەی ﷺ دەبێت، بێگومان

بــۆ شــوێن كــەوتنی پێغەمبــەریش دەبێــت ســـەرەتا بناســـرێت و خۆشبویسترێت.

بەم هۆیـەوە دەڵـێین: "هـەر دایك و بـاوكێكی موسـوڵمانی سـەر ئـەم زەوییە، پێویستە گەیاندنی (خۆشەویستی پێغەمبەر) بەدڵی منداڵەكەی بە گـەورەترین بەرپرسـیاریەتی بزانرێــت، واتــە پێویســتە پێغەمبــەر بــە منداڵەكانیان ئاشنا بكەن، " بۆ هەموو مرۆڤایەتی بەگشتی و بۆ منداڵانیش بەتایبەتی پێویستیەكی گەورە و گرنگـە. هاوەڵـە بـەرێزەكانیش ئەمـەیان پەیرەو كردووە، كاتێك لەدوای سورەتەكانی قورئان، سیرەت و سوننەتی پێغەمبەریان لە منداڵەكانیان گەیاندووە.

ئەوانـەی منداڵـەكانیان لـە خۆشەویسـتی پێغەمبـەر بێبـەش دەكـەن، گـەورەترین خراپـەیان بەرامبـەر كـردوون، خۆشویسـتنی خـواو پێغەمبـەر لەئیمانەوەیـە بـەڵكو خـودی ئیمانـە، ئـەو كەسـەی لـەم خۆشەویسـتییە بـــەدووربێت بەكەســێكی خـــاوەن ئیمـــانی ڕاســـتەقینە ناژمێردرێـــت، خۆشەویستی پێغەمبەرﷺ لەدوای خۆشەویستی خوا دێت، خۆشەویستنی پێغەمبەرﷺ بەمانای خۆشویستنی خوا دێت.

مەككەییەكان لەبەر موسوڵمان بـوونی ویسـتبوویان خوبـەیب بكـوژن، لەوكاتەدا كە خەریك بوون، خوبەیبیان دەكوشت ئەبوسوفیان چووە لای و پێی وت:

" دەتەوێت لـەجێی تـۆ ئێسـتا موحەممـەد ﷺ بوایـە؟ و تـۆش لـەناو خێزانەكەتدا بویتایە؟! "

خوبەیب وەڵامی دایەوە:

" سوێند بەخوا ڕازیم بەوەی ماڵ و ژیان و منداڵم نەمێنێت بۆ ئـەوەی بەتەنها دڕكێك نەچێت بەقاچی موحەممەدﷺدا"

ئەبو سوفیان وتی:

"لـــەناو هـــەموو مرۆڤەکانـــدا نەمـــدیوە، قـــەومێك وەکـــو هـــاوەڵانی موحەممەد، موحەممەدیان خۆش بوێت"

رسول الله خزمەتکارێکی هەبوو بەناوی (ثەوبان) ئەوەندە پێغەمبـەری خوای خۆشدەویست کە ئارامی لێ بڕابوو، واتە بەبێ ئـەو نـەدەژیا، ڕۆژێك زۆر بەناڕەحەتیی و خەمباریەوە هاتە لای پێغەمبـەر ﷺ پێغەمبـەری خـوا لەحاڵی پرسی ، ئەویش وەڵامی دایەوە:

" ئەی پێغەمبەری خوا ! هیچ شوێنێکم نایەشێت، تەنها چەند ڕۆژێکە تۆم نەدیوە، دڵم پڕیوو بۆت، زۆر بیرم کردیت، ترسام لە ئاخیرەتدا بەهۆی ئەوەی جێگەی تۆ بڵند دەبێت، لێت دوور بم، ترسـان لەجیابونـەوەت ئـەم حاڵەی بەسەر هێنام". لەوکاتەدا خوای گەورە ئەم ئایەتەی ڕەوانەکرد:

﴿ وَمَن يُطِعِ اللّهَ وَالرَّسُولَ فَأُوْلَـئِكَ مَعَ الَّذِينَ أَنْعَمَ اللّهُ عَلَيْهِم مِّنَ النَّبِيِّينَ وَالصِّدِّيقِينَ وَالشُّهَدَاء وَالصَّالِحِينَ وَحَسُنَ أُولَـئِكَ رَفِيقاً﴾(النساء: ٦٩)

پێغەمبەری خوا ﷺ لە باسی پەروەردەی بنچینەییدا، داواکارییەکانی لە گەورەکانی خێزان بەم شێوەیە ڕیزکردووە:

"هیچ باوکێك دیاریەك لە ئەدەبی جوان باشتر بە کوڕەکەی نادات."

"منداڵەکانتان بەباشی پەروەردە بکەن، پـەروەردەو ئـەدەبیان جـوان بکەن."

" خێـرو چـاکە فێـری خێـزان و منداڵـەکانتان بکـەن و، بـەجوانی پەروەردەیان بکەن."

" منداڵەکانتان پەروەردە بکەن و ئەم سێ ڕەوشـتە جوانـە بەدەسـت بهێنن:

پێغەمبەریان لەلا خۆشەویست بکەن، ئـەهلی بـەیتیان لا خۆشەویسـت بکـەن، قورئـان خوێنـدنیان لـەلا شـیرین بکـەن، چـونکە ئەوانـەی قورئـان

دەخوێننەوەو لەسینەیاندا دەیهێڵنەوە، لەڕۆژی دواییدا کە هیچ سێبەرێك نییە، ئەوان لە سێبەری عەرشی خوادا دەبن".

" باشترینتان ئەو کەسەیە کە قورئان فێرببێت و کەسانی تر فێربکات."

هەموو ئەم فەرموودانە زۆر بەباشی پەروەردەیەکی بنەڕەتی و گرنگ بۆ دایکان و باوکان روون دەکەنەوە. ناساندنی خۆشەویستی خواو پێغەمبەرو قورئان... تێگەیاندنی ئەمانەش بە میهرەبانی و ئارامگریەوە... لەمانەش گرنگتر ژیان بەو شێوەیەو بوون بەنموونە بۆ منداڵەکان....

## نموونەیەکی پەندئامێز

## ڕاستگۆیی پێغەمبەرﷺ

دەمەوێت دیمەنێکی ناوازە لەخۆشەویستی پێغەمبەرﷺ لەگەڵ ئێوەدا بەش بکەم:

حیفا، ڕۆژێك دێتە لای پێغەمبەری خوا:

" یا رسول الله! کارێکم فێربکە کە بمگەیەنێتە بەهەشت!"

پێغەمبەری خواﷺ وەڵامی دایەوە:

" سەرەتا پێویستە لەگەڵ کوڕێك هاوسەرگیری بکەیت..بەمە نیوەی دینەکەت دەپارێزیت.."

لەدوای ئەم فەرمانە حیفا وتی:

" یارسول الله! دەبێت ئەو کەسە کێ بێت؟ من مەلیکی حەبەشە نەجاشی داخوازی لێکردم، بەڵام قبوڵم نەکرد، تەنانەت داخوازیکار هەبوو کە سەد حوشترو زۆر زینەتی تری دەدا، ئەوەشم ڕەت کردەوە، ئەمڕۆ کە

دەفەرموویت ڕزگاربوونت لە هاوسەرگیرکردنتدایە، یارسول الله! تۆ کێت بەدڵ بێت و بەگونجاوی بزانیت، من بەو ڕازیم؟؟!"

پێغەمبەری خوا ﷺ بەحیفای فەرموو:

" سبەینێ بەیانی یەکەمین کەس کێ هاتە مزگەوت، لەگەڵ ئەودا هاوسەرگیری بکە"

پاشان بەهاوەڵە بەڕێزەکانی فەرموو:

"سبەینێ هەرکەس یەکەمجار هاتە مزگەوت، ئەم ئافرەتە دەکەمە هاوسەری."

هاوەڵانیش ڕازی بوون.

خوای گەورە خەوێکی دا بەسەر ئەوانەی کە ئەمەیان بیست، کە جگە لە یەکێکیان ئەوانی تر هیچیان زوو بەئاگا نەهاتن، پێغەمبەری خوا ﷺ بە پەرۆشیەوە لەچاوەڕوانیدا بوو کێ یەکەم کەس دەچێتە مزگەوت، لەناکاو صوهەیب بینرا.

صوهەیب هاوەڵێکی بێ کەس و، هەژار و، ئەسمەر و، لاواز بوو.

حیفاش بەڕادەیەکی زۆر جوان و دەوڵەمەندو بێ کەموکورتی بوو.

پێغەمبەری خوا ﷺ لەپاش نوێژ حیفای بانگ کردو ئاگاداری کرد.

حیفاش ڕەزامەندی خۆی بەرامبەر قەزای خوا لەلای پێغەمبەری خواﷺ دەربڕی، لەپاشان پێغەمبەری خوا ﷺ وتاری خوێندەوەو نیکاحی خوێندن و فەرمووی:

" ئەی صوهەیب! هەستە شتێك بۆ ئەو خانمەت بکڕە!"

" یا رسول الله! لەماڵی دنیا یەك درهەمی زیوم نییە"

بۆ ئەمەش حیفا دە هەزار درهەم زیوی هێناو دای بە صوهەیب بۆ خەرجی پێویستیەکانی و پێی وت:

" بیبەو ئەوەی پێویستە پێی بکڕە."

پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی:

" ئەی صوهەیب دەستی خانمەکەت بگرەو بیبە ماڵەوە."

" یارسول الله ! ماڵی من مزگەوتە، بیبەمە کام ماڵ؟"

حیفا وەڵامی دایەوە:

" خانووە گەورەکەمم بەخشیوە بە تۆ، دەتوانی بمبەیتە ئەوێ."

پێغەمبەری خوا زۆر دڵخۆش بوو بە بارودۆخەکەو دوعای بۆ کردن، هاوەڵە بەڕێزەکانیش زۆر ستایشی ئەو ڕەفتارە جوانەیان کردو سوپاسی خوایان کرد، لەپاشان چوونە خانووە گەورەکەیان و لەپاش نان خواردن حیفا وتی:

" ئەی صوهەیب! ئەوە بزانە کە من بۆ تۆ نیعمەتم، تۆش بۆ من میحنەت، تۆ بۆ سوپاسگوزار بوونت لەسەر ئەو نیعمەتەو منیش بۆ ئارامگرییم لەسەر ئەو میحنەتە، وەرە با ئەمشەو بە پەرستش و تاعەتەوە بەرینەسەر، تۆ بەپاداشتی سوپاسگوزاران و منیش بە پاداشتی ئارامگران بگەین، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: کۆشك و سەرایەك لەبەهەشتدا هەیە کە تەنها بۆ ئارامگران و سوپاسگوزارانە".

ئەو شەوە هەردووکیان بەپەرستشەوە سەرقاڵ بوون، حەزرەتی جوبرەئیل (سەلامی خوای لێ بێ) پێغەمبەری ﷺ لەحاڵی ئەو شەوەی ئەوان ئاگادار کردەوەو مژدانەی بە بەهەشت و نووری ئیلاهی پێ دا. بەیانی کە صوهەیب بۆ نوێژ ڕۆیشتە مزگەوت، پێغەمبەری خوا پێی فەرموو:

" ئەی صوهەیب! حاڵی ئەمشەوتان من باسی بکەم یان خۆت باسی دەکەیت؟!"

وەڵامی دایەوە: " ئێوە بفەرموون ئەی پێغەمبەری خوا ؟!"

پێغەمبەری خواش باسی حاڵی ئەو شەوەیانی کردو لەپاشان مژدەی دانیٚ:

" ئێوە بەهەشتین و لەوێ بەدیداری خوای موتەعال دەگەن"

صوهەیب لەخۆشیدا کەوتە سەر زەوی و بەفرمێسکەوە سەری نایە سوجدەو پاڕایەوە: "ئەی پەروەردگارم! ئەگەر لەمن خۆش بوویت، پێش ئەوەی تووشی گوناه ببمەوە ڕۆحم بکێشە!"

خوای مەزن دوعاکەی قبولٚ کردو لەسوجدەدا گیانی کێشا هاوەڵان کە ئەمەیان بینی خۆیان پێ ڕانەگیرا، پێغەمبەری خواﷺ فەرمووی:

" هێشتا شتێکی تر هەیە کە پێی سەرسام بن، حیفاش هەر لەم کاتەدا ڕۆحی تەسلیم کردەوە."

نوێژی مردوویان لەسەر هەردووکیان کردو لەتەنیشت یەکەوە دفنیان کردن، لەپشت سەریانەوە دوو تەختەیان داناو لەسەر یەکێکیان نووسی: (ئەمە گۆڕی سوپاسگوزاری نیعمەتی خوای تەعالایە) و لەسەر ئەوی تریشیان نووسی (ئەمە گۆڕی ئارامگری میحنەتی خوای تەعالایە).

ئەمە سەرەنجامی خۆشەویستی پێغەمبەر بوو ﷺ. خۆشەویستی خواو پێغەمبەرەکەی کە دنیا لەبەرچاو جوان دەکەن، بەبێ شك دەبێت منداڵانی لەسەر ڕابهێنرێت، ئەگەرنا ڕۆحیان وشك دەبێت و ڕەفتارەکانیان نامۆ دەبن.

# پێغەمبەرمانﷺ منداڵانی فێردەکرد که خاوەن کاربن

**ناوەڕۆکی پەروەردەیی**

" چاو مەبڕنە ئەو پارەیەی منداڵ دەیهێنێت تاکو خوای گەورە موحتاجی ئەوەتان نەکات."

**پێغەمبەرمان موحەممەد ﷺ**

پێغەمبەرمان ﷺ وەك چۆن لەهەموو لایەنێکدا بووەتە نموونە بۆ ئوممەتەکەی و وردەکاریەکانی ژیانی فێرکردوون، منداڵانیشی بۆ ژیانی کار ئامادە دەکرد و دەیویست فێری خاوەنداریەتی کارێك ببن.

منداڵان پێویستە لەدوای وەرگرتنی پەروەردەیەکی بنچینەیی، کارێکی باشیش بگرنەدەست، ئەمەش بۆ هەستانیان بە ئەرکی سەرشانیان لەناو کۆمەڵگەداو، گەیشتنیان بەئازادی ئابووری خۆیان کارێکی پێویستە.

پێغەمبەرمان ﷺ لەباسی خاوەندارێتی کارێك کە منداڵ بتوانێت خۆی پێ ڕاگرێت، مامەڵەی نەرم و نیانی هەبووەو زۆر بەتایبەت هەستیاری نیشان داوە لە ئازارنەدانی منداڵ لەپێناو بەدەستهێنانی پارەدا، بێگومان ئامادەکردنی منداڵ بۆ ژیانی کار جیاوازە لەوەی کە منداڵ بخرێتە ژێرباری

کاری قورس و هەڵسوکەوتی نەشیاوی لەگەڵدا بکرێت و ئازار بدرێت.
ئاگادارکردنەوەی پێغەمبەر ﷺ لەم بابەتەدا زۆر جددیە:

"منداڵان ناچاری پارە پەیداکردن مەکەن، ئەگەر ناچاریان بکەن ڕەنگە دزی بکەن. چاویش مەبڕنە پارەیەك کە ئەوان دەیهێننەوە تا خوا موحتاجی ئەو پارەیەتان نەکات، خواردنی پاك و حەڵاڵ شایستەیە بە ئێوە".

ڕاڤەی ئەم فەرمودە تایبەتەی پێغەمبەرمان ﷺ زۆر باش حاڵی ئەو منداڵانەمان تێدەگەیەنێت کە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا زۆریان لێ دەکرێت بۆئەوەی پارە پەیدابکەن.

کارکردنی منداڵ لەکۆمەڵگەدا بۆ پەیداکردنی بژێوی خێزانە، کە ئەوەش منداڵ بێ پەروەردەو ناتەندروست دەهێڵێتەوەو ڕێگە لە گەشەسەندنی کۆمەڵایەتی و پێشکەوتنی دەگرێت، لەکاتێکدا پێویستە پەروەردە وەربگرێت و پەرە بەتواناکانی بدات و پێشکەوێت، هەر بەزوویی دەخرێتە ژێر باری قورسی ژیانەوەو دەکەوێتە کێشمەکێشمی ژیانەوە، لایەنێکی خراپی تری ئەوەیە ، منداڵان دەکەونە کۆڵان و شەقامەکانەوە و لەخێزان دادەبڕێن، کە ئەمڕۆ بە (منداڵانی کۆڵان) ناودەبرێن.

بێگومان بنەڕەتیترین هۆکاری کارکردنی منداڵان هەژارییە، خێزانەکان لەجیاتی ناردنی منداڵان بۆ قوتابخانە دەیانخەنە سەر ڕێگای ئیش کردن، بەئامانجی ئەوەی بەوجۆرە باشتر ژیان بناسن و کاربکەن.

ئەو کاتە منداڵ بەهۆی کارکردنەکەیەوە، لەژیانی منداڵیی خۆی دادەبڕێت، لە پەروەردەو فێربوون دووردەکەوێتەوەو گەشەی ڕۆحی و جەستەیی دوادەکەوێت، ئەمەش لەبەرئەوەی دەکەوێتە سەر کارو فێری چۆنێتی ژیان دەبێت، کە بەڕووکەش وا دەردەکەوێت منداڵەکە بردویەتیەوە، بەڵام بەتەواوی دۆڕاوە.

پێغەمبەرمان ﷺ ڕووبەڕووی کارکردنی منداڵ لەتەمەنی بچوکی و بێ پەروەردە مانەوەیی و خستنەبەری بەرپرسیاریەتی گەورە وەستاوەتەوە، ئەوەی پێغەمبەر ﷺ دەیویست ئەوەیە کە ئامادە بکرێن بۆ کارکردن لەداهاتوودا ، تاکو بتوانن خاوەنی کارێك بن بۆ بەدەستهێنانی بژێوی خۆیان.

پێغەمبەر ﷺ کە هاتە مەدینە، هاوەڵی بەڕێز ئەنەسی تەمەن دەساڵانی هێنایە لای خۆی، ماوەی دەساڵ گرنگی پێدا، لەو ماوەیەدا ئەو کارانەی کە لەتوانایدا بوو پێی دەسپارد، لەگەڵ ئەوانەشدا هیچ ئازاری پێ نەدەگەیاند هەمیشە بەڕووی شیرینەوە مامەڵەی لەگەڵ دەکردو بۆ ژیان ئامادەی دەکرد.

پێغەمبەر ﷺ بەگوێرەی توانای منداڵ کاری پێ دەسپاردن، کارێکی پێ نەدەسپاردن کە نەیتوانن، بەم شێوەیە ئەو منداڵەی کاری پێ دەسپێردرا بۆ فێربوون، هەم ئیرادەی خۆی بەهێز دەکرد، هەم یارمەتی ئەوانی تریشی دەدا. پێویستە هەل بەمنداڵ بدرێت و، تواناکانی پێش بخرێت، ئەو منداڵانەی پەرە بە تواناکانیان دراوە و متمانەیان بەخۆیان هەیە، لەداهاتوودا ژیانی خۆیان پێ بەڕێوەدەبرێت، ئەوەی گرنگە، بەدەست هێنانی ئەو هێزی ئیرادەیەیە.

## نموونەیەکی پەندئامێز

## توانای بەدەست هێنانی کار

کەنجێك هاتە لای پێغەمبەر ﷺ و کۆمەڵێك پێویستی خۆی بەیان کرد، پێغەمبەریش ﷺ پرسیاری کرد کە لەماڵەوە چی هەیە!

ئەویش وتی کە جامێکی ئاو لەگەڵ پارچە فەرشێکی هەیە، پێغەمبەر ﷺ داوای کرد کە ئەو شتانە بهێنێت کە گەنجەکە هێنانی، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: " کێ ئەم دوو پارچەیەم لێ دەکرێت؟"

پیاوێك هەستاو وتی: " من بەیەك درهەم دەمەوێت"

پێغەمبەر ﷺ پرسی: " کەس هەیە لەدرهەمێك زیاتری پێ بدات؟"

پیاوێکی تر وتی: " من بەدوو درهەم دەمەوێت."

پاشان پێغەمبەر ﷺ ماڵەکەی دا بەدوو درهەم، پارەکەی دابە گەنجەکەو فەرمووی: " بەدرهەمێك خواردن بۆ منداڵەکەت بکڕە، بەدرهەمەکەی تریش تەورێك بکڕە و وەرەوە بۆ لام."

گەنجەکە تەورەکەی کڕی و گەڕایەوە.

پێغەمبەر ﷺ تەورەکەی بەستەوە بەناوقەدی پیاوەکەوەو پێی فەرموو: "دەی بڕۆ داربڕەو بیفرۆشە"

پیاوە گەنجەکە لە ماوەی ١٥ ڕۆژدا لەکاری داربڕیندا دە درهەمی پەیدا کرد پێویستیەکانی پێ دابین کرد، پاشان هاتەوە لای پێغەمبەر ﷺ ئەویش کە بەو جۆرە بینی پێی خۆشحاڵ بوو فەرمووی:

" لەسەر پشتت دار باربکەیت و بژێوی دابین بکەیت، زۆر باشترە لەوەی بە لەکەیەکی ناوچەوانتەوە سواڵ بکەیت"[1]. هەروەها فەرموویەتی: " کەس لەخواردنی دەستی خۆی باشتر ناخوات".[2]

---

١- سنن ابی داود، رقم الحدیث: ١٤١١

٢- سنن ابن ماجە، رقم الحدیث: ٢١٣٤

# پێغەمبەرمانﷺ منداڵانی هان دەدا ڕێزی دایك و باوكیان بگرن

**ناوەڕۆكی پەروەردەیی**

" مامەڵەی باش لەگەڵ دایك و باوكتان بكەن، تا منداڵەكانیشتان لەگەڵ ئێوە باشبن."

**پێغەمبەرمان موحەممەد ﷺ**

پێغەمبەری ئازیزمان ﷺ لەتەمەنی منداڵیدا دایك و باوكیشی لەدەست داوە، ئەو ئاگری جوداییەیە كە لەو بچووكیەیدا چۆتە ڕۆحییەوە و، هەموو تەمەنی بەردەوام بوو، لەبەرئەوە زۆر نرخی دایك و باوكی بەباشی دەزانی.

پێغەمبەر ﷺ هەروەك چۆن هەمیشە ئامۆژگاری كردووە كە دایك و باوك منداڵەكانیان خۆش بوێت و گرنگیان پێ بدەن و لێیان تێبگەن، بەو جۆرەش ئامۆژگاری منداڵانی كردووە بە ڕێزگرتنی گەورەكان، چونكە لەنێوانی دایك و باوك و منداڵاندا چەندە پەیوەندیەكی نزیكانەو دروست هەبێت ئەوەندەش پەروەردەی منداڵ و كێشە خێزانیەكان ئاسان و ساكار دەبنەوە منداڵ ئەوەی كە لەدایك و باوكی و دەورووبەری دەیبینێت، كەسایەتی و كارەكتەری خۆی لەسەر دروست دەكات.

منداڵ لەناو خێزاندا بەپێی ئەو ڕەفتارانەی کە فێر بووە هەڵسوکەوت دەکات، بۆیە پێویستە دایکان و باوکان ببنە نموونەی شیاو و ناوازە بۆ منداڵەکانیان چونکە ئەگەر باش بن یان خراپ، دایك و باوك بۆ منداڵ پێشەنگی پەروەردەو فێربوونی سەرەتایین منداڵ ئەوەی کە لەدەوروبەرەوە وەریدەگرێت، بەهەموو تایبەتمەندیەکیەوە لەدایك و باوکەوە فێربووە.

لەبەرئەوە لەپەروەردەی منداڵدا گرنگە سەرنجی ئەمە بدرێت، چونکە منداڵیش خاوەنی توانای هەڵسەنگاندنە لەنێوان گوفتارو کردارەکانماندا، ئەوەش زۆر ڕوونە کە دایك و باوك چەندە خۆشەویستی بەمنداڵ بدەن، هەر ئەوەندەش گرنگی و بایەخ لەوانەوە دەبیننەوە، ئەمەش بەتەواوی بەو مانایە دێت کە ئێمە چەندە کاری چاکەمان بەرامبەر دایك و باوکمان کردووە، لەمنداڵەکانیشمانەوە ئەوەندەمان پێدەگاتەوە. لەبەرئەوە پێغەمبەری ئازیزمان ڕێنمایی خێری دایکان و باوکانی کردووە بەرامبەر منداڵەکانیان و منداڵەکانیش بەرامبەر دایك و باوکیان.

قورئانی پیرۆز و فەرموودەکانیش پلەیەکی بەرز بەدایك و باوك دەدەن و منداڵ بەڕێزگرتن و هەست بەبەرپرسیاریەتی کردن فەرمان پێ دەکەن، لەم باسەدا خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿وَاعْبُدُواْ اللّهَ وَلاَ تُشْرِكُواْ بِهِ شَيْئاً وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَاناً وَبِذِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَالْجَارِ ذِي الْقُرْبَى وَالْجَارِ الْجُنُبِ وَالصَّاحِبِ بِالجَنبِ وَابْنِ السَّبِيلِ وَمَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ إِنَّ اللّهَ لاَ يُحِبُّ مَن كَانَ مُخْتَالاً فَخُوراً﴾ النساء: ٣٦

واتە: (عیبادەت بۆ خودا بکەن و هیچ جۆرە شەریکێکی بۆ بڕیار مەدەن، نە بت نە غەیری بت. وە لەگەڵ دایك و باوکتان چاك بن و ئازاریان مەدەن و زۆر بە نەوازش دڵیان ڕاگرن. لەگەڵ خزم و خوێشدا چاك بن و یارمەتییان بدەن. بەزەییتان بە هەتیواندا بێتەوە. لەگەڵ دراوسێی نزیك و

دراوسێی دوورتان چاك بن. لەگەڵ ئەوانە كە لە ئیش و كارو سەفەرو مەدرەسەو غەیرەدا لەگەڵتانن چاك بن. یارمەتی موسافیرو لە ماڵ و كەسوكار براو بدەن. لەگەڵ ئەو عەبدو جاریانەدا كە موڵكتانن مامەڵەو هەڵسوكەوتتان چاك بێت. خودا ئەو كەسەی خۆش ناوێ كە فیز بەسەر خەڵكدا بكات و خۆی لەوان بە گەورەتر بزانێ.)[1]

﴿ووَصَّيْنَا الْإِنسَانَ بِوَالِدَيْهِ حَمَلَتْهُ أُمُّهُ وَهْناً عَلَى وَهْنٍ وَفِصَالُهُ فِي عَامَيْنِ أَنِ اشْكُرْ لِي وَلِوَالِدَيْكَ إِلَيَّ الْمَصِيرُ﴾ لقمان: ١٤، واتە: (ئادەمزادمان ڕاسپاردووە دەربارەی باوك و دایكی، دایكی لە كاتی سستی لەسەر سستیدا، كە كاتی دووگیانییەتی، لە سكی خۆیا هەڵیگرتووە. جیابوونەوەی لە سكی دایكی بە لەدایكبوونیەو، لە كۆش و بەرمەكانی بە برینەوەی لە شیر لە دووساڵایە. ڕامان سپاردووە كەوا بەرانبەر بەم ئازار و ئەزیەتەی دایكت لەگەڵتی كێشاوە سوپاسی منیش و باوك و دایكیشت بكەو سەرەنجامیش دێیتەوە بەردەستی خۆم پاداشی یا سزای كرداری دنیات ئەدەمەوە.)[2]

پێغەمبەری ئازیزیشمانﷺ دەفەرمووێت:

" ڕەزامەندی خوای گەورە، لە ڕەزامەندی دایك و باوكدایە، تووڕەیی ئەویش لە تووڕەیی دایك و باوكدایە."

" لە گەورەترین گوناهە گەورەكان، شەریك پەیداكردن بۆ خواو مامەڵەی خراپە لەگەڵ دایك و باوك."

" پیاوێك هات بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ وتی: كێ لە هەموو كەس شایستەترە كە من چاكەكاریم لەگەڵیداو، شیاوی هاوڕێیەتییە؟ فەرمووی:

---

١- خولاصەی تەفسیری نامی، ل: ٨٤

٢- خولاصەی تەفسیری نامی، ل: ٤١٢

(دایکت). وتی: پاشان کێی تر؟ فەرمووی: (پاشان دایکت). وتـی: پاشـان کێتـی؟ فـەرمووی: (پاشـان دایکـت). وتـی: پاشـان کێـی تـر؟ فـەرمووی: (پاشان باوکت)."[1]

کاتێـک لـەو ئایـەت و فەرموودانـە وردەبینـەوە مـومکین نییـە دانەچڵەکێین! لەبەرئـەوەی پێغەمبـەری ئازیزمـان لەگـەڵ هـەموو ئـەو ئافرەتانەی یارمەتیان دابوو بەجوانی مامەڵەی دەکرد و ڕێـزی تایبـەتی لێ دەگرتن، با تەماشای چەند نموونەیەك بکەین لەم بابەتەدا:

پێغەمبـەری خـواﷺ کاتێـک لـەعومرەی حودەیبیـەدا بـەرەو مەککـە دەڕۆیشت، مۆڵەتی لەخوای گەورە داواکردو سـەردانی گـۆڕی دایکـی کـرد، لـەکاتی زیارەتەکەیـدا گۆڕەکـەی دایکـی ڕێکخسـت و لـەو کاتـەدا هەسـتی جۆشاو گریا، ئەو موسـوڵمانانەش کـە پێغەمبـەریان ﷺ بینـی، گریـان لـە پاشان پرسیاریان لە هۆکاری گریانەکەی کـرد، ئـەویش فـەرمووی: "بـیری میهرەبانی و سۆزی دایکمم کرد، بۆیە گریام".

کاتێك پێغەمبەری خـواﷺ لـەدایك بـوو بـوو، جاریەیـەکی ئەبولەهـەب بـەناوی (سـوەیبە) مـاوەی هەفتەیـەك شـیری پێـدا بـوو، پێغەمبـەرﷺ بەدرێژایی تەمەنی زۆر جوان مامەڵەی لەگەڵ ئەو ئافرەتە دەکردو چاکەی بەرامبەر دەنواند، لەکاتی کۆچکردنیدا بـۆ مەدینـە، پێغەمبـەری خـوا ﷺ بەردەوام خواردنی بۆ دەنارد، لەگەڵ ئەوانەی هاتوچۆیان دەکرد بەردەوام سەلامی بۆ دەناردو لەحاڵی دەپرسی، ئـەم گرنگـی پێدانەشـی تـا وەفـاتی سوەیبە بەردەوام بوو، تەنانەت دوای ئەوەی هەواڵی مردنی ئەوی بیستبوو، پرسیبووی ئایا کەسوکاری نزیکی هەیە یان نا، پاشان زانیبووی کە کەسی نییە.

---

١- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٥٦٣٣

دایکی شیریی پێغەمبەرﷺ -حەلیمە خاتوون- جارێك هاتبووە مەککە و سکاڵای کردبوو لەلای پێغەمبەر ﷺ "کە لە وشکەساڵیەکی ترسناکدان و ئاژەڵەکانیان زۆر لاواز بوون..." پێغەمبەریش ﷺ کە لەو کاتەدا هاوسەری خەدیجە خاتوون بوو و نیشتەجێی مەککە بوو، بزنە لاوازەکەیی و هەروەها حوشترێکیش کە بارەکەی بۆ هەڵگرێت پێدا بوو، دیسان ڕۆژێك حەلیمە خاتوون، هاتە خزمەتی پێغەمبەری ئازیز، ئەویش ﷺ یەکسەر لەجێی خۆی هەستاو بە " دایە گیان .. دایە گیان" ڕێزو خۆشەویستی بۆ دەربڕی و لەسەر عەباکەی خۆی داینیشاند.

لێرەدا خێزانی ئەبو طالبیش فاطمە خاتوون جێی خۆیی هەیە، ئەم خانمە بەرامبەر بە پێغەمبەری خوا ﷺ، کە لەتەمەنی هەشت ساڵیەوە دەچووە ماڵی ئەوان، مامەڵەی باشی دەکردو وەکو منداڵەکانی خۆی تەماشای دەکرد. پێغەمبەری خوا ﷺ لەبەرامبەر باشی ئەو خانمانەی کە لەکاتی منداڵیدا باش بوون بۆی، بەدرێژایی تەمەنی مامەڵەی جوانی کردووەو کەمتەرخەمی لە ڕێزگرتنیاندا نەکردووە، لەبەر ئەوە تاو تاو سەردانی ئەویشی دەکردو لەحاڵی دەپرسی، لەکاتی مردنی فاطمە خاتوونیش دا، پێغەمبەری خوا ﷺ وتەی " دایکم مرد ! " ی بەکارهێناوەو بەکراسەکەی خۆی کفنی کردووەو خۆی ناشتوویەتی، کاتێك کەسانی دەوروبەریشی پرسیاریان کردووە لەهۆکاری ئەو گەرموگوڕیەی بۆ مردنی فاطمە خان، پێغەمبەری خوا ئەم وەڵامەی دابوونەوە: " لەدوای ئەبو طالب کەسێکی تر وەکو ئەم ئافرەتە بەڕێزە، باشی بەرامبەرم نەنواندووە، ئەم کراسەی خۆمم کرد بە کفن بۆی تاکو لەڕۆژی دواییدا بەرگی بەهەشت بپۆشێت، بۆ ئەوەش کە لەناو گۆڕەکەیدا بحەوێتەوە لەگەڵ خۆیدا ڕامخست." لەبەرامبەر سەرسوڕمانی ئەو کەسانەشدا کە بۆ گەرمی و

هەستیاری پێغەمبەر ﷺ لە مردنی فاطمە خاتوون هەبوو بوو، نیشانیان دابوو، پێغەمبەری خوا ﷺ ئەم وتە پڕمانایەی فەرمووە:

" ئەو دایکی من بوو! منداڵەکانی خۆی بەبرسی دەهێشتەوە، ئەو سەرەتا سکی منی تێر دەکرد، قژی شانە دەکردم، ئەو دایکی من بوو! "

هەموو ئەمانە ئەوەمان نیشان دەدەن کە: گرنگترین لایەنی پەروەردەیی ئەوەیە کە منداڵ فێری ڕێزگرتن و مامەڵەی باش بکرێت، دایکان و باوکان لەپێشدا و گەورەکانی خێزان و خزمانی تریش لەپاشان. ئەگەر منداڵ ئەم پەروەردە باشەی پێ نەگات، ئەوا لەناو کۆمەڵگەدا بەدرێژایی ژیانی کاری هەڵە دەکات و پەیوەندی ناتەندروست نمایش دەکات. پێویستە لەبیرنەکرێت دایك و باوك چۆن مامەڵە لەگەڵ پیرەکانی ناو خێزاندا بکەن، هەر بەو ئەندازەیەش لەمنداڵەکانیانەوە ڕێزو چاکەیان پێ دەگاتەوە.

## نموونەیەکی پەندئامێز

## کۆتاساتی ڕۆڵەیەك

ئافرەتێك بەڕاکردن هاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ:

" عەلقەمەی مێردم، لە کۆتا ساتی نەخۆشیەکەیدایە، ئەی پێغەمبەری خوا، ماوەیەکە دەمەوێت شەهادەتی پێ بهێنم، بەڵام ناتوانێت بیڵێت، دەترسم بەبێ شەهادەهێنان بمرێت، چارەسەرێك بۆ ئەمە بدۆزەرەوە ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ. "

پێغەمبەر ﷺ پرسیاری لە ئافرەتەکە کرد، کاتێ مێردەکەی تەندروستی بووە چۆن ژیاوە:

" پیاوەکـەت چـۆن دەژیـا؟ موسـوڵمانیەتی خـۆی دەهێنایـەجێ و موسوڵمانانە دەژیا؟"

ژنەکە وتـی: "ئـەی پێغەمبـەری خـوا، هاوسـەرەکەم دینداریـەکی وای نـەبوو، ئـەوەی پێویسـت بـوو لـە موسـوڵمانیەتی ئـەنجامی دەدا، کـاری حەرامی نەدەکرد و خووی خراپی نەبوو". لەدوای ئەم وەڵامـە پێغەمبـەری خوا ﷺ فەرمانی کرد:

" کەوایە ، برۆ و دایکی بانگ بکە ! "

پاش کەمێك ئافرەتێکی پیر هاتە خزمەتی، ئەم ژنە پیرە دایکی پیاوە نەخۆشـەکە بـوو" مـن دایکـی عەلقەمـەم ئـەی پێغەمبـەری خـوا، بانگتـان کردووم ، هاتم"، پێغەمبەری خوا ﷺ لە ئافرەتەکەی پرسی:

" لە عەلقەمەی کوڕت ڕازیت؟ ئەو ئەرکی خۆی بەجێهێنا وەکـو ڕۆڵـەو فرزەندی تۆ؟! "

ئافرەتە پیرەکـە کـەمێك وەسـتا، لەڕووخسـاریدا نیشـانەیەك لـە زویـر بوون و دڵ شکان دەرکەوت .

" ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ، کوڕەکەم تا ئەو کاتەی هاوسەرگیری کـرد کەمتەرخـەمی نـەدەکرد لـەڕێزگرتنم، بـەڵام نـازانم لەبەرچـی لـەدوای هاوسەرگیرییەوە، بەتەواوی گۆڕا، لەبەرئەوە من دڵم لێی شکاوە."

لەدوای ئەم قسانەی ئافرەتـە پیرەکـە، پێغەمبـەر ﷺ فـەرمانی کـرد بەوانـەی دەوروبـەری کـە دار کۆبکەنـەوەو ئاگرێـك داگیرسـێنن دیـارە کـە دایکـی عەلقەمـە گـەردنی کوڕەکـەی ئـازاد نـەدەکرد، دەبـوو بـەوە ڕازی بکرێت. ئافرەتە پیرەکە بە پەرۆشیەوە پرسی:

" ئاگر بۆچی دادەگیرسێنیت ئەی پێغەمبەری خوا ؟"

پێغەمبەری خوا ﷺ وەڵامی دایەوە:

" بۆ ئەوەی عەلقەمەی کوڕتی تیابسوتێت"

ئافرەتی پیر، بەپەرۆشی و ترسەوە پرسی:

" بۆچی دەتەوێت کوڕەکەم بسوتێنیت ئەی پێغەمبەری خوا؟"

پێغەمبەری خوا وەڵامی دایەوە:

" چونکە لەسەر قسەی خێزانەکەی، دایکی ئازار بدات و بەهۆی وەسوەسەی ناحەقی خێزانەکەیەوە دایك و باوکی زویر بکات، خوا لە ئاگری بەبڵێسەی دۆزەخدا دەیسوتێنێت ئەگەر تۆ گەردنی ئازاد نەکەیت، عەلقەمەش ئەوەی بەسەر دێت من لێرە بەو ئاگرەی دونیا دەیسوتێنم، تاکو لەئاگری دۆزەخ ڕزگاری ببێت."

لەدوای ئەم قسانە ئافرەتی پیر وتی:

" ئەی پێغەمبەری خوا من گەردنی ئازاد دەکەم ڕازی نیم بەسوتانی کوڕەکەم نە لەدنیاو نە لە قیامەتیشدا."

لەپاش گەردن ئازادی ئەو دایکە بۆ کوڕەکەی، پێغەمبەر ﷺ بیلالی حەبەشی و سەلمانی فارسی لەگەڵ چەند کەسێکی تر نارده ماڵی عەلقەمە:

" بڕۆن ، بزانن ئەو گرێیەی سەرزمانی عەلقەمە، کراوەتەوە؟"

کاتێك ئەوان گەیشتنە ماڵی عەلقەمە، ئەو شەهادەی هێنا بوو، خەریك بوو ڕۆحی دەسپارد.

## پێغەمبەرمان ﷺ
## گەنجەکانی بۆ داهاتوو ئامادە دەکرد

**ناوەڕۆکی پەروەردەیی**

" کچێکی گەنج و لاوێکی خوێن گەرمم بینی، ترسام لەوەی شەیتان بچێتە نێوانیانەوە."

**پێغەمبەرمان موحەممەد ﷺ**

پێغەمبەرمان ﷺ بۆ پێگەیشتنی گەنجەکان و پەروەردەیان و پاراستنیان بایەخی تایبەتی پێداون و ئەمانەشی دانە دانە لەژیانیدا پەیڕەوکردووە، پێغەمبەری ئازیزمان کە زانیویەتی چینی گەنجان ئەگەر لەڕووی ماددی و مەعنەوییەوە پەروەردەیەکی تەندروست و بەرزو باش وەربگرن، کۆمەڵگە لە ئاسوودەیی و بەختەوەریدا دەبێت، بۆیە هەمیشە پەیامی یەکگرتووی و پێکەوەبوونی بە گەنجان داوە.

" ئەی بەندەکانی خوا، ڕقتان لەیەك نەبێتەوە، ئیرەیی بەیەك مەبەن، پشت لەیەك هەڵمەکەن، ببنە برای یەکتر".[١]

پێغەمبەرمان ﷺ بەتایبەت دەیویست گەنجان لەسەر ئەو ڕۆحیەت و تێگەیشتنە پێبگەیەنێت، چونکە ئەگەر نەوەی داهاتوو، کە گەنجانن بەم

---

١- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٥٧٢٣

شێوەیە پەروەردە بکرێن، ئەوا کۆمەڵگە لە ئاسایشدا دەبێت، لەپێناو ئەوەی سەرکەوتووبن و هەمیشە لەژیاندا نموونەبن، پێغەمبەر ﷺ ڕێنمایی گەنجانی کردووە بە دوورکەوتنەوەیان لەحەرام و هاوڕێیەتی کردنی کەسانێکی باش، لەبەر ئەوەش هاوکاری گەنجان بووە بۆ هاوسەرگیریی و دۆزینەوەی کار.

بۆ پێگەیشتنی گەنج ئەو دەوروبەرەی تیایدا دەژی و هاوڕێکانی ڕۆڵێکی زۆر گەورەیان هەیە، بەپێی سروشتی بەدیهێنانی مرۆڤ، هیچ کەسێکی بێ هاوڕێ نییە کە بۆ یارمەتی وەرگرتن یاخود خوو پێوەگرتن پێویستی نەکەوێتە کەسانی تر، هەمووکەسێك لەژیانی کۆمەڵایەتیدا بەدڵنیاییەوە دەوروبەر و کەسی نزیك و دۆستی خۆشەویستی هەیە، پێویستیی هاوڕێیەتی بەتایبەتیش لەتەمەنی گەنجیدا بایەخێکی گەورەتری هەیە، چونکە لەگەڵ چوونە سەری تەمەندا بەدروست کردنی پەیوەندی خزمایەتی نوێ و گرنگیدان بە خێزان و منداڵ مرۆڤ ڕەنگە بەئەندازەی سەردەمی گەنجی گرنگی بە هاوڕێیەتی نەدات.

بەڵام گەنجەکان کە لەتەمومژاویترین ساتەکانی ژیاندان و بەردەوام لەدەست تێنەگەیشتن لێیان سکاڵا دەکەن، لەپێویستی هاوڕێ گەلێکدان بۆ هاوبەشی پێ کردنیان لەکێشەکانیاندا، لەبەر ئەوە لەخوێندنگەو، لەکۆلان و لەشوێنی کاریان لەگەڵ گەنجانێك کە بەنزیکیان دەبینن، هاوڕێیەتی دروست دەکەن و ئەوەندە وابەستەیان دەبن، کە زۆرێك لەوەی هەیانە لە ماددەو مەعنەویات لەگەڵ هاوڕێکانیاندا بەشی دەکەن و تەنانەت هەندێ هاوڕێ ئامادەیی ئەوەی هەیە کە گیانی خۆی لەپێناو هاوڕێکەیدا بەخت بکات. گرنگترین بنەما کە پێویستە لێرەدا سەرنجی بدرێت ئەوەیە کە ئایا (**هەڵبژاردنی هاوڕێ چۆنە !**).

پێغەمبەری مەزن ﷺ وەکو هەموو باسێکی تر و لەم باسەشدا کە ئاگادارکردنەوەیە فەرموویەتی:

" مرۆڤ لەسەر دینی هاوڕێکەیەتی، لەبەرئەوە بزانن هاوڕێیەتی کێ دەکەن ! "[1]

مەبەست لە (مرۆڤ لەسەر دینی هاوڕێکەیەتی)، (دین واتە چۆنێتی ژیان)، لەڕاستیشدا هاوڕێی باش هاندەرە بەرەو کاری چاك و کردەوەی جوان، هاوڕێی خراپیش هاوەڵەکەی بەرەو گوناهکردن ئاڕاستە دەکات، ئەوەتا پێغەمبەرمان ﷺ لە فەرموودەیەکدا کە ئەبو موسا ڕیوایەتی کردووە فەرموویەتی:

" نموونەی هاوڕێی باش و هاوڕێی خراپ، وەك هەڵگری میسك (بۆنفرۆش)و کوردەمێن وایە، ئەوەی کە میسکی هەڵگرتووە یان پێت دەبەخشێت یان پێت دەفرۆشێت (بە لایەنی کەمەوە) بۆنێکی خۆشی لێوە بۆن دەکەیت، بەڵام کوورەدەمێن یان پۆشاکەکەت دەسوتێنێ، یان بۆنێکی پیسی لێوە بۆن دەکەیت. "[2]

پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ لە باسی ئەوەدا کە چی بکرێتە پێوەری هاوڕێیەتی لە فەرموودەیەکدا کە ئەبو سەعیدی خودری ڕیوایەتی کردووە دەفەرموێت:

" تەنها هاوڕێیەتی ئیمانداران بکە و، با خواردنەکەت کەسێکی بەتەقوا بیخوات".[3]

---

١- مستدرك على الصحيحين للحاكم، رقم الحديث: ٧٣٨٨

٢- صحيح مسلم، رقم الحديث: ٤٨٦٨

٣- سنن الترمذي، رقم الحديث: ٢٣٧٦

پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ لەکەدارنەبوونی کەسایەتی و بایەخی مرۆڤ بوونی گەنجەکان ویستویەتی خۆیان لە حەرام و گوناهەکان بپارێزن، چونکە نەفس و شەهوەتی مرۆڤ کە پاکی و بێگەردی ڕۆح لەناودەبات، بەزۆری لەگەنجاندا زاڵە و کاریگەرییان لەسەر دادەنێت، وەك ئەو دەربڕینەی بەدیعوززەمان سەعیدی نوورسی کە دەڵێت:" گوناه کە دەچێتە دڵەوە ڕەشی دەکات، ڕەشبوونەوەکەشی تا ئەو کاتەی نووری ئیمان لەدڵ دەردەهێنێت، زیاد دەکات". بوونی نەوەیەکی لەم جۆرە لەکۆمەڵگەدا بەمانای نەگبەتی دێت.

لەو یادەوەرییەی فەضلی کوڕی عەبباسدا، هەستیاری پێغەمبەرمان ﷺ لەم بابەتەدا بۆ دەردەکەوێت: لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ بەرەو مینا دەڕۆیشتین، دەشتەکیەك کچێکی جوانی لەگەڵ بوو، هاتە لای ئێمەو لەگەڵمان کەوتەڕێ من تەماشای کچەکەم دەکرد، لەو کاتەدا پێغەمبەر ﷺ سەیری کردم و یەکسەر ڕوومی لەسەر کچەکە وەرگێڕا ، دواتر دیسان سەیرم کردەوە دیسان ئەویش ڕوومی وەرگێڕا، لەکۆتاییدا سێ جار ئەمەی کرد، لەپاشان فەرمووی:

" ئەی کوڕی براکەم! ئەمڕۆ ڕۆژێکی وەهایە، ئەو کەسەی چاوی لە حەرام بشارێتەوە و زمان و شوێنە مەحرەمەکانی بپارێزێت گوناهەکانی دەسڕێنەوە.[1]

چینی چاوەڕوانی لێکراوی گەنجان ، تا چەندە خۆیان لە نەفس و وەسوەسەکانی شەیتان بپارێزن، بەو ئەندازەیە کۆمەڵگەش پارێزراو دەبێت، لەبەرئەوە پێغەمبەرمان ﷺ بەتایبەتی گرنگی بە مەسەلەی هاوسەرگیری و کەوتنە سەرکاری گەنجان داوە، نموونەی زۆر لەسەر ئەم

---

١- صحيح مسلم، رقم الحديث: ٢٤٥١

بابەتە هەیە، لەوانەش با باس لەوەبکەین کە پێغەمبەری خوا لەگەڵ کچەکەی خۆی کردوویەتی:

حەزرەتی عەلی چووبووە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ بۆ داخوازی فاطمە ، ئینجا وەك بلێی ئەوەی دەیویست بیلێت بیری چوو بووەوە، زمانی بەجۆرێك گیرابوو، پێغەمبەر خوا بەوتنی: "بەهەر حاڵ هاتویتە داوای فاطمە ! "، یارمەتی دا، حەزرەتی عەلی بەدڵخۆشیەوە وتی:" بەڵێ! " هەروەها لەڕووی جوانکاری و کەلوپەلی ماڵەوە توانای ماددی نەبوو.

پێغەمبەر ﷺ لەمەشدا یارمەتی دا، بیری خستەوە کە دەتوانێت قەڵغانەکەی بفرۆشێت، بەڵام خواردنی ئاهەنگەکەش پێویست بوو پیاوێك لە هاوەڵان بەرانێکی بە حەزرەتی عەلی دا، ئەنصاریەکانیش لەناو خۆیاندا گەنمەشامییان بۆ کۆکردەوە، خواردنی ئاهەنگ ئامادەکرا، پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ حەزرەتی عەلی و فاطمە پاڕایەوە:

" خودایە ! هەردووکیان بەختەوەر بکە، هاوسەرگیریەکەیان خێردار بکە"، لەماڵی حەزرەتی عەلیدا وەك کەلوپەل؛ حەسیر و سەرین و جێگەیەکی خەوتن و، سوراحی و دییزە هەبوون، ئەمانەشی بەپارەی قەڵغانەکەی کڕی، پێغەمبەریش ﷺ وەکو جیازی "پارچە قوماشێك، سوراحیەکی ئاو، سەرینێك و دۆشەکێکی خووری دا بە فاطمە"

هەموو ئەم نموونە بەرجەستانە، هەوڵەکانی پێگەیاندنێکی نموونەیی گەنجمان لای پێغەمبەری خوا ﷺ بۆ دەردەخات، لەڕاستیدا ئەمە گرەنتی کۆمەڵگەشە، ئەو کۆمەڵگەیەی گەنجەکانی لەدەستداوە ژیانیان ڕووخاو و لەناوچووە.

## نموونەیەکی پەندئامێز

## هاوکاری لەهاوسەرگیریدا

هاوەڵێك هەبوو بەناوی (ڕەبیعە) کە خزمەتی پێغەمبەری ﷺ دەکرد، پێغەمبەری خوا ﷺ کە دەیبینی تەمەنی بەرەو سەر دەچێت، لێی پرسی: " بیر لە هاوسەرگیری دەکەیتەوە؟" ڕەبیعە کە بیری لە باری خراپی ماددی و بەردەوامی دانی بەخزمەتە گرنگەکەی دەکردەوە وتی:" نەخێر"

پێغەمبەریش ﷺ دیسان پرسی: ڕەبیعەش هەمان وەڵامی دایەوە، لەسێیەم جاردا ڕەبیعە بیری کردەوە کە ئەوە حیکمەتێکی تێدا بێت بۆیە وتی: "دەمەوێت هاوسەرگیری بکەم، فەرمان بدە چی بکەم ئەی پێغەمبەری خوا؟"

لەدوای ئەمە پێغەمبەر ﷺ ڕەبیعەی نارده ماڵی خێزانێکی ئەنصاری ئەویش ڕۆیشت و بەو شێوەیەی پێغەمبەر ﷺ ڕایسپاردبوو سەلامی گەیاندو داوای کچەکەیانی کرد، ئەوانیش بێ دوودڵی ڕەزامەندییان نیشان دا، ڕەبیعە بەدڵخۆشیەکی زۆرەوە ئەنجامەکەی گەیاندەوە بەپێغەمبەر ﷺ، هەروەها ئەو هەژار بوو، بۆ کەلوپەلی ماڵ و خواردن و پێویستیەکانی پارەی دەویست، پێغەمبەر ﷺ یەکسەر داوای لە هاوەڵان کرد، هاوکارییەکی بە پەلە کەوتە گەڕو بەپارە کۆکراوەکە ئاڵتونی مارەیی و کەلوپەلی ماڵ و بەرانێکیش کڕدرا، پێغەمبەریش ﷺ لەماڵی خۆی جۆی دانێ بۆ دروست کردنی نارد، بەم جۆرە بەهۆی بایەخی زۆری پێغەمبەری خۆشەویستمانەوە دەیان هێلانە پێکەوەنراوە و نەوەیەکی نوێ زیادی کردووە.

# بەشی سێیەم

## مامۆستایەتی پێغەمبەرمانﷺ لەژیانی کۆمەڵایەتیدا

پێغەمبەرمان موحەممەد ﷺ سەرەڕای نەخوێندەواریەکەی، دەروونناسێک، کۆمەڵناسێک و پەروەرشیارێک بووە، بۆ چارەسەری هەموو کێشە کۆمەڵایەتیەکان، ئەو پێکهاتن و یەکڕیزیەی لەژیانی کۆمەڵدا دایهێناوە، تائێستاش کاریگەرترین و پەیڕەوکراوترین ڕێبازە، کێشەیەکی کۆمەڵایەتی نیيە کە موحەممەد ﷺ چارەی بۆ دانەنابێت، ئیتر ئەوە زۆر بەباشی ڕوونە لەلامان کە ئەو کەسانەی بەڕێوەبەرو ئاراستەکاری کۆمەڵێکن، زۆر پێویستیان بە یاسا کۆمەڵایەتیەکانی موحەممەد دەبێت.

**تۆتو ڤۆن بیسمارك**

# پێغەمبەرمان ﷺ
# مامۆستای هەمووان بوو

**فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ**

" من وەکو مامۆستا نێردراوم."

**پێغەمبەرمان موحەممەد ﷺ**

بەم فەرموودەیەی پێغەمبەرمان ﷺ کە وەکو مامۆستا بۆ هەموو مرۆڤایەتی نێردراوە، بەکردارو گوفتار بۆتە پێشەنگ و نموونە لە ڕاستی و دادپەروەریدا، نهێنیەکانی دنیاو ئاخیرەتی فێری خەڵکی کردووەو پەروەردەکارێکی سەردەمیی بووە.

ئازیزمان، بەکەسایەتییە بێ وێنەکەیی و میهرەبانی و، لێبوردەیی و، مامەڵە جوانەکانی، لەناو دڵەکاندا بەجۆرێك گەورە بووە کە بووەتە خۆشەویستراوترین ڕووخسار و باشترین مامۆستای هەموو چین و توێژێك. بە تێپەڕبوونی سەردەمەکان خۆشەویستی ئەو زاتە هەموو دڵەکانی گرتەوەو، هەموو دنیای لەئامێز گرت. جوانی جوانان، وتەیەکی هەیە کە هەموو دنیا حەیران دەکات:

" هەركەس لەئێوە ئەوەی بۆ خۆی پێی خۆشە بۆ براكەشی پێی خۆش نەبێت، ئیمانی تەواو نەبووە."[1]. چونكە لە وتاری ماڵئاواییدا دەیفەرموو: "هەموو موسوڵمانان بران"، ئەم وتە كەمەندكێشانەی هەموو لاشەكانی لەیەك ڕۆحدا كۆكردبوەوە دڵی ملیۆنانی لەدەوری ئەو نوورە بەپەرۆشیەوە وەستاندبوو، ئیتر مرۆڤایەتی یەك ئومێدی هەیە: (مامۆستای هەمووان پێغەمبەرمان موحەممەد ﷺ)..

ئەو لە هەموو كاتێكدا بە وتە و كردارەكانی سەلماندویەتی كە مامۆستای هەموانە، مومكین نییە خوێنەرانی ژیاننامەی ئەو، پەندوەرنەگرن و سەرسام نەبن و پێی گەورە نەبن. ئەو جوانی جوانانە مامۆستای هەمووان بوو، بەڵام ئەم پلەیەی بەهێزو دەسەڵات و پارە بەدەست نەهێنا، ئەو ئەم پلەیەی بە بەسەرهاتی ژیانی نموونەیی و سەركەوتووی خۆی كە نموونەیە بۆ هەموو مرۆڤەكان بەدەست هێنا، بناغەی ئەم چیرۆكە سەركەوتووەی ژیانیشی، ئارامگری و هەوڵدان بوو.

پێغەمبەری ئازیزمانﷺ شایستەی (مامۆستایەتی هەمووان) و پیاهەڵدان و وەسف كردنە، ئەمڕۆ سەردەمێكە زۆر لەپێویستی ناساندنی ئەو وەسفانەدایین.

---

[1]- صحيح البخاري، رقم الحديث: ١٣

# پێغەمبەرمان ﷺ
# مامۆستا بوو لە خاکی بووندا

**ڕێنمایی پێغەمبەر ﷺ**

**" ئەوانەی بۆ خوای گەورە خاکی دەبن، خوا بەرزیان دەکاتەوە، ئەوانەش کە خۆیان گەورە دەکەن، خوا نزمیان دەکاتەوە"**

**پێغەمبەرمان موحەممەد ﷺ**

پێغەمبەری ئازیزمان ﷺ بەدرێژایی تەمەنی، ژیانێکی سادەو وەکو یەکێك لەهەموو ئەوانی تر ژیاوە، ئەوەندە پەیوەندیەکی جوانی لەگەڵ مرۆڤەکان دروست دەکرد و ئەوەندە جوان دەچووە ناو دڵیانەوە کە کەسێك نەماوە لەو سەردەمەدا سەلامی لێ نەکردبێت، دەچووە ناو خەڵکەوەو خۆی لەوان بەگەورەتر نەدەزانی، چونکە فەرمانی خوای گەورە لەو مەسەلەیەدا بەم شێوەیەیە:

﴿ وَلا تُصَعِّرْ خَدَّكَ لِلنَّاسِ وَلا تَمْشِ فِي الْأَرْضِ مَرَحاً إِنَّ اللَّهَ لا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتَالٍ فَخُورٍ﴾(لقمان: ١٨). واتە: (ڕووی خۆت وەرمەچەرخێنە لە خەڵك کە فیزت نەهێنێ ڕوویان تێ بکەی و قسەیان لەگەڵ بکەی و، بەفیز و

خۆپەسەندییەوە بەسەر زەویدا مەڕۆ. بێگومان خوا خۆشی نایەت لە هیچ کەسێکی خاوەن فیزو دەعیەو شانازی بەخۆوە کردوو.)[١]

پێغەمبەریش ﷺ دەیفەرموو: ئەوانەی بۆ خوا خاکی دەبن، خوا بەرزیان دەکاتەوە، ئەوانەش کە خۆیان بە گەورە دەزانن، خوا نزمیان دەکاتەوە."

ڕۆژێك یەکێك لە هاوەڵان، عەبدوڵڵای کوڕی یاسر کە هاتبووە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ لە ترسا لەرزی بوو، پێغەمبەری خواش ﷺ کە ئەوەی بینیبوو فەرمووبووی: "ئارام بن، مەترسن، من کوڕی ژنێکی قورەیشیم کە گۆشتی وشککراوەی خواردووە."

ڕۆژێك لە ڕۆژان هەمان زات، گۆشتی کوڵاوی مەڕی بەدیاری بۆ پێغەمبەر ﷺ هێنا بوو، پێغەمبەر ﷺ بەگشتی ئەو خواردنانەی بۆی دەهات لەگەڵ هاوەڵە هەژارەکاندا بەشی دەکرد، بەم شێوەیە هەمان ئەو پیاوە کە گۆشتە کوڵاوەکەی هێنابوو لەگەڵ موسوڵمانانندا کەوتە سەر ئەژنۆ دەستی بەخواردن کرد، لەوکاتەدا دەشتەکیەکی کۆچەری هات و سەرسامی خۆی بۆ نەشاردرایەوە و وتی: "ئەوە چۆن دانیشتنێکە؟" چونکە کەوتنە سەر ئەژنۆ، نەریتی لاوازو نەدارەکانە، ئەویش ڕوونکردنەوەی دا بەوەی: "بێگومان خوای خاوەن حەق منی وەکو بەندەیەکی خاوەن ڕێز دروست کردووە، نەك وەکو خۆسەپێنەر و ستەمکار."

عەدی کوڕی حاتەمی طائی، ڕۆژێك لەگەڵ قافڵەیەك هاتبووە مەدینەو چاوی بە پێغەمبەر ﷺ کەوتبوو، پێکەوە بەڕێدا ڕۆیشتبوون، بینیبووی کە پێغەمبەر ﷺ بەئارامگریەوە گوێی بۆ کێشەی ئافرەتێکی پیر گرتبوو، بە

---

١- خولاصەی تەفسیری نامی، ل: ٤١٢

گەڕانەوەشیان بۆ ماڵەوە، میوانەکەی لەسەر دۆشەکەکە دانیشاندبوو و خۆیشی لەسەر زەویەکە دانیشتبوو، ئەم حاڵە ئەوی وەکو بەندەیەکی خاکی، وەکو پێغەمبەر نیشان دابوو، بۆیە ئەم دیمەنانە بەس بوو، بۆ موسوڵمان بوونی عەدی.

بەڵێ ئەم خاکێتییەی پێغەمبەری ئازیزمان ﷺ وایکردبوو ئەوانەی دەیان بینی دڵیان فەتح دەبوو، ئەوەش کەلەسەر شانی ئێمەیە خۆمان بەخاوەنی ئەو ڕەفتارانە بزانین و ئەو جوانیانە بۆ ژیانمان زیاد بکەین.

## پێغەمبەرمان ﷺ
## مامۆستا بوو لە لێبوردەییدا

"مامۆستاكانی ئەم سەردەمە پێویستە گوێیەكانیان
بكەنەوەو گوێ بۆ لێبوردەیی و سنگ فراوانی موحەممەد
ﷺ بگرن، ئەگەرنا مرۆڤەكان لەژێر پەردەی مەدەنی بووندا،
بەردەوامی بە دڕندایەتیان پێ دەدەن"

ئیحسان قاسم

ئێمە یەكەمین شت كە لەدوای ناوهێنانی پێغەمبەر ﷺ دێت بە ئەقڵماندا، میهرەبانی و لێبوردەیی ئەوە، بەپرەنسیپی" ئاسانكار بن، زۆر كاری مەكەن"، لە دەفتەری پەروەردەیی مێژوودا، پەڕەیەكی نوێی هەڵداوەتەوە ئەمە شیاوی ئەویشە، چونكە ئەو بە ڕەحمەت بۆ هەردوو جیهان نێردراوە، بەمیهرەبانی و سۆزداری و لێبوردەییەكەی بۆتە سوڵتانی دڵەكان.

یەكێك لەوانەی زۆرباش لە لێبوردەیی ئەو ئاگادار بوو، خاتوو عائیشەیە كە دەڵێت:

" پێغەمبەری خوا ﷺ قسەی ناشیرینی نەدەوت، هیچ ڕەفتارێكی دوور لە شەرم و ئەدەب و نەرم و نیانی نەدەنواند، لەبازاڕو دەرەوەدا بەدەنگی

بەرز قسەی نەدەکرد و دەنگە دەنگی دروست نەدەکرد، لەڕووی خراپەدا وەڵام دانەوەی نەبوو، دەیبەخشی."

" پێغەمبەری خوا ﷺ بێجگە لە بانگەوازی بۆ لای خوا ، لەهیچ بابەتێکی تردا، هەرگیز نە لەئافرەتێك نە لە خزمەتکارێکی نەداوە. هیچ کەسێك هیچ جۆرە ئازاردان و زیانێکی لەوەوە پێنەگەیشتووە، کە بارودۆخ بەو شێوەیە بێت، هەرگیز بیرناکرێتەوە ئەوانەی دەوروبەریشی هەستی تۆڵەکردنەوەیان تیا دروست ببێت.

هەروەها لەجێیەکدا کە سنووری خوای تیادا ببەزێنرایە، ئەو کات بارودۆخ جیاواز دەبوو، لەوکاتەدا پێغەمبەری مەزن ﷺ لەپێناوی خوای (عزیز و جلیل)دا تووڕە دەبوو، بە ڕەقی مامەڵەی لەگەڵ ئەوە دەکرد کە بەبێ شەرمییەوە بەرامبەر خواو حەرامەکانی ئەو وەستاوە".[1]

پێغەمبەرمان ﷺ لە لێبوردەیی و ڕەحمەتدا، نموونەو پێشەنگی لێبوردەکان بوو، لە هەموو هەلومەرجێکدا ئەو زاتە لەسەر لێبوردەیی خۆی بەردەوام بوو، بۆ نموونە لە وەڵامی ئەو بەردبارانکردنەی خەڵکی طائیفدا تەنانەت سزادانی ئەوانی پێ قبوڵ نییەو بەئومێدی ئەوەی لە داهاتوودا ئیماندارو باوەڕدار لەناویاندا پەیدا ببێت، دوعای هیدایەتیان بۆ دەکات.

داواکەی پێغەمبەری خوا ﷺ هاتەدی دوعاکەی قبوڵ بوو، طائیفیەکانیش لەدوای فەتحی مەککەو جەنگی هوازن، کۆمەڵێکیان هاتنە مەدینەو موسوڵمانبوونی خۆیان ڕاگەیاند. لەبەرامبەر ئەو لێبوردەییەی پێغەمبەر ﷺ دا کەسانی کەللەڕەق و خۆسەپێنی وەکو ئەبوسوفیان و

---

١- صحيح مسلم: رقم الحديث: ٤٣٩٨

مەعاویەی کوڕی و سوهەیلی کوڕی عامرو عیکریمەی کوڕی ئەبوجەهل، دەگۆڕێن و لەپاشان موسوڵمان دەبن.

پێغەمبەری خوا ﷺ بەڕێگەی لێبوردن و سنگ فراوانی خۆشەویستی لەگەڵ تۆوی ئیمان لە دڵەکاندا دەچێنێت و، نەمامی ئیسلام گەشە دەکات. بە هیوای خێرو دوعاکانی، ئەم تۆوانە سەوز دەبن و نەمامەکان باڵادەکەن و گوڵ دەگرن، چونکە ئەو هەمیشە مژدەبەخش بوو، مژدەی دەدا ترسێنەر نەبوو ئاسانکار بوو، زۆردار نەبوو.

لێبوردەییەکەی پێغەمبەر ﷺ دڵەکانی گەرم دەکردەوە، دڵە ڕەقەکانی وەکو قاڵبی سەهۆڵ دەتواندەوە، ئێستا لەم ڕۆژەدا ئەوەی کە پێویستە ئەمە نییە؟!!

# پێغەمبەرمانﷺ

# لەدادپەروەری و ئەمانەتدا مامۆستا بوو

"تۆ تەنها کەسێکی کە شیاوی پلەی (کەسی متمانەپێکراو) بیت، ئەم تایبەتمەندیەی تۆ، ئەو ئاسوودەییە هەمیشەییەی لەمرۆڤەکاندا بەردەوام پێ داوە"

( پرۆفیسۆر دکتۆر ئەکمەلەدین ئیحسان ئۆغلو).

"پێغەمبەرمان ﷺ بە ڕاستگۆی ئەمین ناسرابوو، دۆست و دوژمن (محمد الأمین)یان پێ دەوت، قورئانی پیرۆز (لە سورەتی الأنعام، ئایەتی ١٥٢) دا دەفەرموویێت: ﴿إِذَا قُلْتُمْ فَاعْدِلُواْ﴾[١] واتە: (ئەگەر لە مەحکەمەدا شایەتیتان داو قسەیەکتان کرد ڕاستگۆ بن، درۆ مەکەن با ئەو کەسەیش کە شایەتی بۆ ئەدەن یا شایەتی لەسەر ئەدەن خزم و خوێشتان بن.)

فەرمانیش بەپێغەمبەر ﷺ دەکات: ﴿فَاسْتَقِمْ كَمَا أُمِرْتَ وَمَن تَابَ مَعَكَ وَلاَ تَطْغَوْاْ إِنَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾ هود:١١٢. واتە: (تۆ بەردەوام بە لەسەر ئەو یاساو ڕێ و شوێنەی فەرمانت پێ دراوە لەگەڵ ئەوانەی گەڕاونەتەوە بۆ لای خودا لەگەڵت. توغیان مەکەن و لە سنووری

---

١- خولاصەی تەفسیری نامی، ل: ١٤٩

دەستووری خودا لامەدەن. بەڕاستی ئێوە هەرچی ئەکەن خودا ئەیبینێ و لێی ناشارڕێتەوە.)[1]

پێغەمبەری ئازیزمان پەروەردەیەکی دادپەروەری وای بەهاوەڵانی دابوو، کە ئەگەر کەسی تاوانبار نزیکترین کەسیشیان بوایە هەرگیز دەستیان لە وتنی حەق و ڕاستی هەڵنەدەگرت و وازیان لەدادپەروەری نەدەهێنا.

لە عائیشەوە خێزانی پێغەمبەرﷺ دەگێڕنەوە: کە هۆزی قورەیش مەسەلەی ئەو ژنە مەخزومییەی کە دزی کردبوو لەسەردەمی پێغەمبەرداﷺ زۆر نیگەران و بێتاقەتی کردبوون، کە ئەمەیش لەکاتی گرتنی شاری مەککەدابوو لەناوخۆیاندا وتیان: کێ بێت بتوانێت قسەی تیابکات لەخزمەتی پێغەمبەرﷺ؟ ئینجا وتیان: جا کێ بێ بتوانێت بوێری وا بکات لەخزمەتیدا مەگەر ئوسامەی کوڕی زەید نەبێت، خۆشەویستی پێغەمبەری خوایە، ئینجا ئەو ژنەیان هێنایە خزمەت پێغەمبەرﷺ، ئوسامەش چووە خزمەتی و قسەی لەسەرکرد، پێغەمبەرﷺ ڕەنگو ڕووی تێکچوو فەرمووی: (ئایا بۆ لابردنی سزایەك لە سزاکانی خوا تکادەکەیت؟). ئوسامە وتی: جا کاتێ شەو داهات پێغەمبەرﷺ هەستا و وتارێکی فەرموو: (لەڕاستیدا میللەتانی پێش ئێوە تەنها بەوە تیاچوون: ئەگەر پیاوماقوڵێك لەناویاندا دزی بکردایە وازیان لێ دەهێنا. بەڵام کاتێ کەسێکی گەداو بێکەس دزی بکردایە سزایان بەسەردا جێبەجێ دەکرد. بەڵام سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە ئەگەر فاتمەی کچی محەمەد دزی بکات دەستی دەبڕم).«[2]

---

١- خولاصەی تەفسیری نامی، ل: ٢٣٤

٢- صحیح مسلم، رقم الحدیث: ٣٢٨٣

پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ چاوی لەناحەقی هیچ کەسێك نەدەپۆشی، ڕاستگۆیی و دادپەروەری کە تەواوکەری یەکترن، ئەم دوو خەسڵەتە لە پێغەمبەری خۆشەویستدا تا پلەی کەماڵ هەبوون، لەتەمەنی گەنجییەوە هەمووان بە (ئەمین) ناسیبوویان، هاوڕێ بازرگانەکانی لەبارەی ئەوەوە دەیان وت:

" نەحەقی هیچ کەسێکی دەخوارد، نەدەیهێشت حەقی هیچ کەسێك بخورێت، لەمەسەلەی حەقدا گوێی بۆ خاترگرتن نەدەگرت"

پێغەمبەری ئەمین ﷺ کاتێك فەرمانی پێکرا بەئاشکرا کردنی بانگەوازەکەی لەسەر گردی صەفاوە بەقورەیشیەکانی فەرموو:

" ئەگەر بەئێوە بڵێم لەپشتی ئەو شاخەوە ئەسپسوارەکانی دوژمنتان بۆ ئێرە دێن، باوەڕ دەکەن؟!" وەڵامیان دایەوە بەوەی:" بەڵێ، باوەڕدەکەین، چونکە تۆ لەژیانتدا درۆت نەوتووە!"

کەللەڕەقەکان بەدرێژایی بانگەوازی ناو مەککە، بۆ لەکەدارکردنی پێغەمبەرو ناوزڕاندنی لەلای بیانیەکان و ڕێگرتن لە بڵاوبوونەوەی خێرای ئیسلام، پێغەمبەریان بە (شاعیر، شێت ، سیحرباز) ناودەبرد، بەڵام هەرگیز نەیانتوانیوە بە (خیانەتکارو درۆزن) ناوی ببەن، تەنانەت لەکاتی گەیشتنی نامەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەشامەوە بەدەستی ئیمپراتۆری بیزەنتی، پرسیار کردنی ئەو لە دوژمنی هەرە گەورەی پێغەمبەر کە ئەبوسوفیان بوو، لەوەی " ئایا درۆتان لێ بیستووە؟!"، ئەبوسوفیان ناچار بوو بڵێت:"نەخێر، هەرگیز".

" پێغەمبەر ﷺ بەو پێشەنگیەی کە نیشانی داوە لە دادپەروەری تاکەکەسی و ژیانی تایبەتیدا ، هەر بەو ئەندازەیەش لەناو کۆمەڵگەشەوە فێری ئەو دادپەروەری و یاسا پەیڕەوکردنەی کردوون."

شوێنکەوتووانیشی کە ویستوویانە بەشێك لەو دادپەروەری و دەستپاکییەی ئەو پەیڕەو بکەن، لەمێژوودا بوونەتە جێگەی پەنجە بۆ ڕاکێشان و سەرنج دان. لەئەمڕۆشدا لەهەرکات زیاتر لەپێویستی ڕێبەری ئەمین و ڕاستگۆ داین.

# پێغەمبەرمانﷺ
# لە ئازایەتیدا مامۆستا بوو

" کاتێك لە جەنگدا دەشکاین دەچووینە پشتی
پێغەمبەرەوە ﷺ"

هاوەڵی بەڕێز عەلیرضي الله عنه

پێغەمبەری سەروەر لەگەڵ ئەوەی میهرەبان و خاوەنی نەرم و نیانی ناوازە بوو، لەهەمان کاتدا مرۆڤێکی پاڵەوان و چاونەترس بوو، لەو قورسی و ڕێگرانەی دەهاتنە ڕێی پەرێشان نەدەبوو، بەساردی و ژیرییەوە ڕێیەکی دەدۆزیەوە، ئازا و نەبەرد بوو.

زۆر نموونە هەیە لەژیانی پێغەمبەرمان ﷺ لەم ڕووەوە، هەندێکیان وەردەگرین:

پێشەوا عەلی کوڕی ئەبی تالیبرضي الله عنه باسی دەکات:

" لەجەنگەکاندا هیچ کەس وەکو پێغەمبەر ﷺ لەدوژمن نزیك نەدەکەوتەوە، چەند جار لەجەنگدا کە هەستمان بەشکان دەکرد، پەنامان دەبردە لای پێغەمبەر ﷺ"

هاوەڵی بەڕێز ئەنەس دەڵێت:

" پێغەمبەری خوا ﷺ جوانترینی هەمووان و، سەخیترین و ئازاترین کەس بوو، شەوێکیان خەڵکی مەدینە بەدەم دەنگێکەوە ڕاچڵەکان و بەرەو ڕووی دەنگەکە دەرچوون، پێغەمبەرﷺ پێیان گەیشت لەوسەرەوە دەگەڕایەوە، چونکە ئەو بەرلەوان ڕۆیشتبوو بۆ هەواڵی ئەو دەنگە، بەسواری ئەسپەکەی ئەبو تەڵحە کە پشتی ڕووت بوو، پێغەمبەرﷺ شمشێرێك لەملیدا بوو، دەیفەرموو: (مەترسن، مەترسن). ئەنەس دەڵێ: ئەو ئەسپەمان دی زۆر خێرا دەڕۆیشت یان وەك دەریا شەپۆلی دەدا، لەکاتێکدا پێشتر بە ئەسپێکی سست و تەمبەڵ ناسرابوو".[1]

لە جەنگی هوازندا ، سوپای موسوڵمانان ، کە دەگەنە دەروازەی حونەین و جێ پێ شاردراوەکانی تیرەندازەکانی دوژمن دەردەکەوێت و دەکەونە بەر هێرشی ئەوان، سەربازەکانی ئیسلام بۆ ئەوەی خۆیان لەو هێرشە کتوپڕە بپارێزن، لێرەو لەوێ لەگەڵ شەڕکردندا بۆ جێیەك دەگەڕان خۆیان حەشاردەن، لەوکاتەدا پێغەمبەر ﷺ وەکو تاشەبەرد سەنگینی خۆی دەرخست و یەك هەنگاو لە مەیدانی جەنگ نەگەڕایە دواوە، هاوەڵان بەم شێوەیە ئەو ڕووداوە دەگێڕنەوە:

" لەجەنگەکەدا پێغەمبەر ﷺ یەك هەنگاو نەگەڕایەوە دواوە، جەنگ کە وەك ئاگرێکی کڵپەسەندو بەدەورماندا بڵاوبوەوە، هەموومان لەدەوری پێغەمبەر ﷺ خۆمان پەنادا تەنانەت وەستان لەتەنیشت ئەوەوە ، وەکو ئازایەتیەکی زۆر گەورە دەژمێردرا. "

چاو نەترسی ، خاکی بوون، لێبوردەیی، دادپەروەری ، میهرەبانی و بەبەزەیی بوون، ئەمانە بێنە پاڵ یەك، چ مانایەك دەدەن! بەڵێ، پێغەمبەری خوا ﷺ وەك ئەوەی خاکی و، لێبوردە و، دادپەروەرو،

---

١- صحيح مسلم، رقم الحديث: ٤٣٦٦

میهرەبان و بەبەزەیی بووە، چاونەترس و ئازاش بووە، هەر کە باس لەئازایەتی ئەو کرابێت، دادپەروەری بەرپا بووە، خۆجیاکەرەوەکان و ناحەق و ستەمکارەکان لەبەردەم بڕیارو نەبەردیەکانی ئەودا چۆکیان دادەدا، لەبەگەورەگرتنی حەق و پاراستنی دادو پێشگیری کردن لە ستەم و ناحەقیدا، پێغەمبەر ﷺ زۆر نەبەرد بوو، ئەو بەدرێژایی تەمەنی ئازایەتی خۆی لەڕاستی و باشیدا بۆ خزمەت بەکارهێنا، لەهەر کارێکدا کە بۆ مرۆڤایەتی خێری تێدا بێت، مەردانە مامەڵەی کردووە، گومانی تێدانیە ئەو کەسەی کە پێغەمبەری مەزنی ﷺ خۆشدەوێت و لەسەر ڕێبازی ئەو ڕێ دەکات، هەروەك ئەو باشی و خێرخوازی و ڕێگری لە ناحەقی و نادادی لێ دەوەشێتەوە. خەمی خەڵکی ئەم سەردەمەش هەر ئەمەیە...

## پێغەمبەرمانﷺ
## لە ئەدەب و شەرمدا مامۆستا بوو

" پێغەمبەر ﷺ لە کچێکی گەنجی کەنارگیر، شەرمنتر بوو"
هاوەڵی بەڕێز ئەنەسرضي الله عنه

ئەدەب و شەرم، لەڕۆحی پێغەمبەردا ﷺ وەکو گوڵ گەشاوە بوو، تایبەتمەندیەك بوو کە دڵ و چاوی نوورانی کردبوو. ئەو کە گەنجێتی و ناوەندی تەمەنی لە ناوچەی حیجازی عەرەبستاندا کە بەچەندین نەریت و ڕەوشتی دوور لە شەرم داپۆشرا بوو، بەسەر بردووە، بەڵام ئەو لەگەڵ هیچ یەکێك لەو نەریتانەدا ڕانەهاتبوو، خوای مەزن ئەو مۆژدەدەرەی داهاتووی، لەو نەریتە پیسانە پاراستبوو، پێغەمبەر ﷺ هەمیشە ڕقی لەکاری دوور لە شەرم بووەو خۆی لێ بەدوورگرتووە، دوای ئەوەش کە بەپێغەمبەرایەتی هەموو مرۆڤایەتی مۆژدەی پێدرا، ئەدەب و شەرم بەڕادەیەك لەکردەوەکانیدا دەردەکەوت کە هاوەڵان لەبارەیەوە دەیانوت: "پێغەمبەرﷺ لە گەورەکچی ناوپەردە زیاتر شەرمی دەکرد و، ئەگەر شتێکی لا ناخۆش بوایە لە ڕوومەتیا دەمانزانی"[1].

---

١- صحیح مسلم: رقم الحدیث: ٤٣٨٥

پێغەمبـەری خۆشەویسـت ﷺ لـەبارەی یەکێکـەوە کـە لەبـەر شەرمنیەکەی لەلایەن هاوڕێکانیەوە سەرزەنشت دەکرا، فەرموویووی:

" وازی لێ بهێنن چونکە شەرم و حەیا لە ئیمانەوەیە."[1] جارێکی پێغەمبەر ﷺ کە باسی ئەوەی بۆ هاوەڵان کردبوو، حەیاو شەرم وەکو ڕازێنەرەوەی مەعنەوی و جوانییەکی ناوازەیە بۆ مرۆڤ، کەسی خاوەن شەرمی بێرخستبوونەوەو لەم کارە ڕاستە ئاگاداری کردبوونەوە.

پێویستە ئەوە بزانرێت کە شەرمکردن ڕەوشتێکی زۆر بەرز و هەستێکی گرنگە کە بەدرێژایی ژیان کار لەهەموو ڕەفتارەکانی مرۆڤ دەکات و کارەکتەری ئەو کەسە نیشان دەدات، بەم هۆیەوە هیچ کەسێك بەرامبەر ئەمە ناوەستێتەوە و ناڕازی نییە لێی، چونکە لەکاتێکدا کەسی خاوەن شەرم گەورە دەبێت لای ئەوانی تر، کەسی بێ شەرم بێ گرنگی دەمێنێتەوەو نزم دەردەکەوێت، ئەم ڕاستەقینەیە هەموو کەس دەیزانێت.

بۆ هەرکەسێك کە بیەوێت ژیانێکی سەربەرزانە بژی، ئەدەب و شەرم، نوورێکی ئیلاهییە کە وەکو تاج دەچێتە سەری. هەرکەس لەسەریدا بێت لەهەموو خراپیەك بەدووردەبێت، جوانترین نموونەی ئەمەش، پێغەمبەرمان ﷺ نیشانی داوین، ئەو دیمەنە بێ شەرمییەی کە بەهۆی ڕەفتاری دوور لەڕەوشت و ئەدەبەوە لەکۆمەڵگەدا دێتە کایەوە، لەمڕۆماندا بۆتە هەڕەشە بۆ هەمووان.

دەرمانی ئەم ڕەوشت تێکدەر و ڕووخێنەرەی خێزانیش، هەستی شەرم کردنە، ئەمەش لەگەڵ ئیماندا دەبێت چونکە حەیاو شەرم لەئیمانەوەیە.

---

١- صحيح البخاري، رقم الحديث: ٢٤

# پێغەمبەرمانﷺ
# لەئارامگریدا مامۆستا بوو

" جوانی ئیسلام کە باوەشی بەهەموو مرۆڤایەتیدا کردووە
هەرێمێکی بەئارامی چێنراوی موحەممەدە ﷺ"

جەمیل مەریح.

مامۆستایەك کە زۆر باش دەیزانی سەرکەوتن بەئارامگریەوە پەیوەستە، پێغەمبەرمان بووﷺ. لەوانەیە تەنها یەك دانە لەدیمەنی ئارامگریەکانی پەیامێکی تەواو بێت بۆ هەموو مرۆڤایەتی، لێرەدا چەند دانەیەك باس دەکەین:

کافرەکانی مەککە بۆ رێگریکردن لە بڵاوبوونەوەی ئیسلام لەلایەن پێغەمبەرەوەﷺ هێزی زۆر و زەبەندیان بەکاردەهێنا و ئەویان لە بارودۆخی زۆر قورسدا دەهێشتەوە. پێغەمبەریشمانﷺ بۆ بانگەوازەکەی و تێگەیاندنی نووری ئیسلام بە طائیفیەکان رێگەی جۆراوجۆری دەگرتەبەر. طائف یەکێك بوو لە ستراتیژیترین شوێنەکانی عەرەبستان خەڵکی ئەوێ ئیسلامیان پێ بگەیشتایە دەبووە پشتیوانی باشی ئیسلام.

پێغەمبەرﷺ زەیدی کوڕی حارثەی لەگەڵ خۆی برد و، چووە شوێنە کاریگەرەکانی شارەکەو باسی لەئیسلام کرد بۆیان، بەڵام ئەوان وەك

ئەوەی باسەکەی پێغەمبەریانﷺ قبوڵ نەکرد، منداڵ و گەنجەکانیان شوێن خست بۆ بەرد باران کردن و ئازاردانی.

پێغەمبەر ﷺ و زەید هەردووکیان لاشەی پیرۆزیان بریندار بوو. زەیدی پاڵەوان بۆ پاراستنی پێغەمبەر ﷺ لەو بەردانەی تێیان دەگرت چەندەش هەوڵی بدایە نەیدەتوانی ڕێگەیان پێ بگرێت ، پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ زەید بۆ ئەوەی ڕزگاریان ببێت خۆیان فڕێ دایە باخێکەوە، خاوەنی باخەکەش دووبرابوون بەناوی عوتبەو شەیبە، لەدوورەوە چاویان بەحاڵی پەرێشانی پێغەمبەرﷺ و زەید کەوتبوو، زۆر خەمیان بەو حاڵەیان خواردبوو، بە کۆیلەکەیاندا (عەدداس) ترێیان بۆ ناردبوون.

عەدداس ترێی ناو قاپەکەی بۆ پێغەمبەر ﷺ درێژ کرد، ئەویش دەستی برد بۆ ترێکە و بەناوی خوا (بسم الله) خواردی، (بسم الله) سەرنجی عەدداسی ڕاکێشا بۆیە سەرسامی خۆی بەو شێوەیە دەربڕی: وەڵاهی ئەو وتەیە خەڵکی ئەم دەڤەرە نایزانن و نایڵێن."

لەم کاتەدا پێغەمبەر ﷺپرسیاری لە عەدداس کرد:

" ئەی عەدداس لەسەر چ دینێکیت؟"

" خەڵکی نەینەوام و مەسیحیم."

" واتە تۆ هاوشاری ئەو کەسە ساڵحەیت- یونسی کوڕی مەتتا"..

" تۆ چۆن یونسی کوڕی مەتتا دەناسیت؟!"

" ئەو برای منە، ئەو پێغەمبەرە و منیش پێغەمبەرم."

لەدوای ئەوە عەدداس خۆی پێنەگیراو کەوتە سەردەستی پێغەمبەر ﷺ خاوەنی باخەکان لەبەردەم ئەو دیمەنەدا، بەیەکیان وت:

" ئەو پیاوە، بیروباوەڕی کۆیلەکەی تێکدا"، بۆیە لێی تووڕەبوون و وتیان:"بەداخەوە بۆ تۆ! کەوتیتە سەر دەستی ئەو پیاوە و قاچیت ماچ کرد."

عەدداس بەگەورەکانی وت:

" لەسەر زەویدا کەسێك لەم زاتە باشتر نییە، شتێکی بەمن گەیاند، ئەوە تەنها پێغەمبەران دەیزانن."

پێغەمبەر ﷺ بەئازاری ئەو ستەمەوە کە لە طائیف بینی، کەوتەڕێ و گەڕایەوە بۆ مەککە، بەڵام لەوکاتەدا خۆی لەسێبەری هەورێکدا دەبینیەوە، بەسەرنجەوە تەماشای کردو حەزرەتی جوبرەئیلی لە هەورەکەدا بەدی کرد.

جوبرەئیل(علیه سلام) بە پێغەمبەری ﷺ فەرموو: "بێگومان خوای گەورە، ئەوەی بیست کە لەقەومەکەتەوە پێت وترا، فریشتەی ئەو شاخانەم بۆت ناردووە، لەسەر ئەو قسانەی قەومەکەت پێیان وتیت، دەتوانیت فەرمان بەوان بکەیت، داواکەت بەجێ دەهێنن".

پێی وت کە: فریشتەی کێوەکان لە فەرمانی تۆدان و بەو شێوەیەی دەتەوێت دەتوانن لەنێوان دووکێوی ئەبو قوبەیس و قویقن دا کافرەکان بدەن بەیەکدا.

پەروەردەکاری ئەقڵەکان، خۆشەویستی دڵان و مامۆستای هەموان کە ناخی پڕ بوو لەبەزەیی و میهرەبانی، فەرمووی:

" نەخێر، من شتی وام ناوێت، تەنها دەمەوێت کە خوای گەورە لەنەوەی ئەم کافرانە وەچەیەك بخاتەوە کە پێش بەدینی خوا نەگرن و پەرستشکار بن بۆ خوای گەورە."

هەرچەند ئەوان خراپەیان نواند بەرامبەری و بەردیان تێگرت و بێ ئەدەبییان کرد، بەڵام پێغەمبەرمان ﷺ هێندە بە ڕەحم بوو کە تەنانەت دوعایەکی خراپیشی لێ نەکردن، چونکە ئەو مامۆستا بوو، هاتبوو تاکو ببێتە نموونە بۆ مرۆڤەکان، ئەمە کاری پێغەمبەرانە لەبەرئەوە پێغەمبەری خوا ﷺ ژیانێکی زۆر سادەو خاکی ژیا.

ڕۆژێك پێشەوا عومەرﷺ ڕۆیشتبووە زیارەتی سەرداری مرۆڤایەتی، پێغەمبەر ﷺ لەسەر حەسیرێك خەوتبوو، خۆری دادپەروەری، حەزرەتی عومەر ﷺ لەبەرامبەر ئەو دیمەنەدا خۆی پێ ڕانەگیرابوو، کە پێغەمبەرﷺ فرمێسکی لە چاوی عومەر بینی فەرمووی:

" بۆچی دەگریت ئەی عومەر؟"

" ئەی پێغەمبەری خوا! قەیسەر و کیسراکان، لەسەر پەڕی باڵندەکان بخەون و تۆش کە سەروەری هەموو جیهانیت لەسەر حەسیرێك بخەویت... وەڵاهی ئەوە زۆر قورس بوو لەلام!"

" ئەی عومەر ئێمە چ پەیوەندییەکمان لەگەڵ دنیا هەیە؟! بیر لە ڕێبوارێك بکەرەوە، لەکاتی ڕێکردنیدا بۆ حەوانەوەیەك دەچێتە ژێر دارێکەوە، لەپاشان بەردەوامی بە ڕۆیشتنەکەی دەدات، ئێمەش لەم دنیایەدا وەك ڕێبوارێك واین، با دنیا بۆ ئەوان بێت، ئاخیرەت بۆ ئێمە بەسە".

ئەو مامۆستا بوو...

مامۆستای هەمووان...

بۆتەواوکردنی ڕەوشتە جوانەکان هاتبوو....

ئەو چارەسەر بوو.. بۆ هەموو کەس.. بۆهەموو کێشەکان.....

# پێڕست